لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

٩١

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا

سالّی هەشتەم
کانونی دووەمی ٢٠١٦

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی






No:

# 91

کانونی دووەمی

2016

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فــارس

زاهـیــر زانــا

گوڵان حەمەئەمین

محەممەد مێرگەیی

محەممەد هاشم

وەهاب حەسیب

یەحیا محەممەد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەریو دیزاین**

جمال دەروێش

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی: شەقامی سالم -

تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی چوارەم- نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر: ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥ - ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

Facebook bryarmagazine

bryarmagazin@gmail.com

چاپ: پیرەمێرد

دابەشکردن: پەیك/ 07708649210

نرخ: 2500 دینار




# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی هەشتەم - ژمارە 91 - کانونی دووەم 2016










# کارگێڕیو بازاڕسازی

# ساڵێکی نوێ،
# باخچەیەکی نوێ بۆ خەونو ئاواتەکانمان

بۆ مرۆڤە خاوەن ئامانجو هیواو خەونە گەورەکان، هەموو ساتێکی نوێ، هەلێکی نوێیە!

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك لە تەمەن، بە دڵێکی شادمانو بەتەواوی دڵنیاییو سوپاسگوزارییەوە، ئاوڕێك بۆ ساڵی ڕابوردوو دەدەنەوەو دڵخۆش بەوەی کە لە ساڵی ڕابوردوودا کۆمەڵێك کاری جوانو بەسوودیان ئەنجام داوە!

توانیویانە لە پاداشتی تەمەندا، کۆمەڵێك یادگاریی جوان تۆمار بکەن..

لە گوڵزاری تەمەندا، چەندین گوڵەباخی جوان بڕوێننو وەها دیمەنێك بە ژیان ببەخشن، کە خودی خۆیان، پێش کەسانی دی مەستی بۆنو بەرامی بنو زێتر ژیانی خۆیان خۆش بوێت!

هاوکات بە جۆشوخرۆشو حەزو ئارەزوویەکی بێسنوورەوە ڕووەو ساڵی نوێ هەنگاو دەنێنو ئومێدەوارن، ئەمساڵ زۆر لە ساڵی ڕابوردوو بەبەرەکەتتر بێت.

ئەوان بۆ بەهەدەردانو بەسەرچوونی تەمەن ئاهەنگ ناگێڕن! ئەوان ئاهەنگ بۆ کارە گەورەکانو خزمەتە ناوازەکانیان دەگێڕن!

هەموو ئەو ساتانەی کە بە کاری بەسوودو جێبەجێکردنی بەرنامەو ئامانجو گەیشتن بە خەونەکانەوە بەسەریان بردووە، لای ئەوان جەژنو خۆشیو ئاهەنگە!

ئاوان ڕاناوەستن لە کارکردن؛ چونکە باشترین کاتی ئەمڕۆ، لای ئەوان ئێستایە! بەڵێ هەر ئێستا!!

ئەوان باوەڕیان وایە، کە سەرکەوتنو گەیشتن بە ئامانج، بە چەپڵەڕێزان نایەت، دەبێت هەوڵی بۆ بدەیت، سەرەتای ساڵی نوێ، بە ئاواتەخوازمو هیوادارمو خۆزگە دەخوازم دەست پێ ناکەن! بەڵکو بە بڕیار دەست پێ دەکەن، بڕیار؛ چونکە هەموو دەسکەوتەکان؛ گەورە بێ، یان بچووك، سەرەتا بە بڕیار دەست پێ دەکات!!

کەواتە: سەرەتای ساڵی نوێ، لەگەڵ ئەو کەسانەدا دامەنیشە، کە بڕیاری ئاهەنگێڕانیان داوە، بەڵکو لەگەڵ ئەو کەسانەدا کۆڕبەندی بکە، کە دەتوانن باشترین شتی نێو ناخت بدۆزنەوە، ئەوانەی هاوخەونو هاوئامانجی تۆن، ئەوانە باشترین هاوڕێتن!

دەی ئازیزم، هەڵەکان بقۆزەرەوە، کاتەکان بەفیڕۆ مەدە، چاوەڕێی کات مەکە، هێندە گورجوگۆڵو چالاك بە، کات فریات نەکەوێت! تەمەنت زۆر لە ڕۆژەکانی ژیانت درێژتربن، با هەموو چرکەیەکی ژیانت نوێ بێت، نەك تەنها ساڵی یەك ڕۆژ!!



# کارگێڕی بە گوفتار

ئەو کەسـەی بەمنداڵی لە شـوێنێك دانەنیشـێت، کە حەزی لێی نییە، بەگەورەیی لە شـوێنێك دانانیشێت، کە حەزی لێیەتی!

ئیبن مەسعوود

ئەو کەسە ژیرو هۆشمەندە، کە ژیانی پڕ دەکات لە کاری چاکە؛ چونکە لەوە گەیشتووە، کە ژیان زۆر لەوە کورتترە، بە کاری خراپە پڕی بکاتەوە.

تۆفیق حەکیم

ئەو کەسەی شەرم لە خەڵکی دەکاتو شەرم لە خۆی ناکات، هیچ ڕێزێکی خۆی لانییە.

سەعالیبی

پەند لەو کەسانە وەرگرە کە لەپێش تۆدا هاتوونو ڕۆیشتوون، مەبە بە پەند بۆ ئەو کەسانەی کە لەدوای تۆوە دێن.

ئەرستۆ

کارو کاسبی ناڕەواو حەرام، لە کۆتاییدا یەکسانە بە دۆڕانو خەسارەتمەندی.

هزدیوس

# خولیاکانت، جیهانی تۆ درووست دەکەن!

دەگێڕنەوە: کابرایەك لە نیشتەجێی دارستانەکان بوو، سەردانی هاوڕێیەکی دەکات، لە یەکێك لە شارە جەنجاڵو ئاڵۆزەکاندا، ئەو کاتەی پێکەوە بە یەکێك لە شەقامە قەرەباڵغەکاندا گوزەریان دەکرد، هاوڕێی دارستانی، بە هاوڕێی شاری گوت:

من لەم ژاوەژاوەدا، هەست بە زیکەزیکی مێرووەکان دەکەم!

هاوڕێکەی بە سەرسوڕمانەوە گوتی: چۆن دەتوانی لەم شوێنە پڕ لە هەراو دەنگەدەنگەدا، گوێت لە دەنگیان بێت!؟

دووبارە گوتی: من گوێم لە دەنگیانەو ئێستاش بۆ ڕاستی قسەکەم، شتێکت نیشان دەدەم، پاشان چەند سکەیەکی کانزایی لە گیرفانی دەرهێناو فڕێی دایە سەر زەوی، هاوکات کۆمەڵێکی زۆر لە ڕێبواران، ئاوڕیان دایەوە؛ تا سکەکان ببینن!

لەو کاتەدا کابرای دارستانی، بە هاوڕێکەی گوت: خەڵکی تەنها سەرنج دەدەنە ئەو دەنگانەی، کە لەگەڵ خولیاو گرنگیدانی خۆیاندا دەگونجێت!

ئەمانە گرنگی بە پارە دەدەن، هەر بۆیە توانییان لەم ژاوەژاوەدا ئاگاداری دەنگی سکەکان بن، منیش خولیام دەنگی دارودرەختو مێرووی زیانبەخشە، هەر بۆیە دەنگی مێرووەکان، سەرنجیان ڕاکێشام!

## لەم چیرۆکەوە فێردەبین:

١- گرنگیی مرۆڤ، لە خولیاو گرنگی پێدانەکانیدایە، گرنگی بە چی دەدەیت؛ تۆ ئەوەیت!

٢- خولیاو ئامانجو ئاواتت چییە، ئەوە سنووری ژیانو بزوتنەوەو هەوڵدانی تۆیە!

٣- ئەو کاتەی شتێك دەبێتە خولیات؛ دەتوانیت لە هەموو بارودۆخێکدا سەرنجی بدەیتیو کاری بۆ بکەیتو پێی بگەیت!

٤- دەکرێت مرۆڤ زۆر گەورە بێت، کاتێك خولیاکانی گەورەن، بەپێچەوانەشەوە: دەکرێت زۆر بچووك بێت، کاتێك خولیاکانی زۆر بچووکن.

٥- خولیاکانت ئەو بازنەیەیە، کە تێیدا دەخولێیتەوەو کاتو پارەو وزەو تواناکانتی تێدا سەرف دەکەیت، جا بزانە ئەو بازنەیەی تۆ هەڵت بژاردووە، چییەو چۆنە!!

٦- پێویستە ئەوەش بزانیت، کە ئامانجت هەرچییەك بێت، گەر نەیکەی بە خولیا، هەرگیز تێیدا سەرکەوتنی گەورە بەدەست ناهێنیت.



# تەنها بۆ سەرکردەکان

ناتوانین حوکم بەسەر هیچ گەلێکدا بدەین، تا ئەو کاتەی داهاتووی دەبینین، سەرۆک بازرگانی هیوایە!

**ناپلیۆن پۆناپەرت**

مەڕەکان بەبێ شوان، ناتوانن مێگەل دروست بکەن! واتە خەڵکی بەبێ سەرکردە، ناتوانن شۆڕش دروست بکەن!

**پەندێکی ڕووسی**

ئەگەر ناتوانی سەرکردایەتیی خۆت بکەیت، هەوڵ مەدە سەرکردایەتیی کەسانی دی بکەیت.

**ولیام بین**

یەکەم هەنگاوی سەرکردە، بریتییە لە خزمەتکردن!

**جون ماکسویل**

فەرمانڕەواو دەوڵەتی ستەمکار، بەردەوام نابێت!

**عەبدوڕەحمان کەواکیبی**

سەلیقەی کارگێڕی

# بەڕێوەبەر، کاتی خۆی چۆن بەسەر دەبات؟

## بەشی دووەم

### هەوێنو هێمای دەستە، یان گیانی پێکەوەیی بپارێزە

ورەو هەوێنو هێمای پێکەوەبوون بۆ هەر کۆمەڵێك، دوو توخمی بەبایەخن؛ چونکە خەڵکی بە دەست کارکردنێکەوە، کە لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە دوورەکان، یان گشتییەکاندایە، تاڵیو سوێریی زۆر دەچێژن. وەکو: زۆرکردنی قازانجو چاکترکردنی کار، ئەمەش بەتایبەتی لە کاتێکدایە، کە ڕاستەوخۆ، ئەنجامی کارەکانیان دەست ناکەوێت. هەر لەبەرئەوەشە، کردوکۆششێکی گەورەتر، لە بەدیهێنانی دەستکەوتە تاکەکەسییە ڕەواو خێراکاندا بەخەرج دەدەن. بۆ نموونە: پاداشو شاباشو ڕێزو سوپاس، یان تەنانەت کارکردن لەگەڵ دەستەکەشدا، بۆ هێنانەکایەی چەند دەستکەوتێکە، کە بەدیهێنانیان بە تاقی تەنیا، سەختەو نالەبار.

بەڕاستی بایەخی هەوێنو هێمای دەستە، یان گیانی پێکەوەیی، لێرەدا خۆی حەشارداوە. بێ دوودڵی کارکردن لەگەڵ کۆمەڵدا چێژبەخشە، مایەی ئاسوودەییە، بەربەستی نێوان مرۆڤو بێزارییە. بۆئەوەی ئەم هەوێنو گیانی بەدەمیەکەوەبوونە گەشەبکات، پێویستی بە هزروهۆشێکی بەهێزوپێزو بەتەنگەوەچوونێکی زۆروزەوەند هەیە، ئەم بەتەنگەوەچوونو بایەخدانەش، لە سەرنجدانێکی ئەرێنیو خوازراودا، لەبارەی نووسینگەی کارمەندێك، لە سوپاسو پێزانینێکدا کە هەڵی بواسیت بە تابلۆی ڕاگەیاندنەوە، لە هێنانی ڕیزێك چا لەبەر بەدیهێنای دەستکەوتێك، یان بەخێرهێنانی کەسێکدا، خۆی دەبینێتەوە. جا ئەگەر بە هاوشێوەی ئەم چاکسازییە مرۆییە سادانە، دەستپێشخەریت کردو ڕچەت شکاند؛ ئەوا تۆ، هاوکاریو سەرکەوتوویی زۆرتر دەچنیتەوە.

### چی دەزانیت فێری کارمەندەکانتی بکە

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، کاتێکی درێژ لە فێرکردنی کارمەندەکانیدا بەسەر دەبات، گەرچی لە سەرەتادا وا دەردەکەوێت، قایلبوونی بە بایەخی ڕاهێنانو مەشقکردنی کارمەندەکان دژوارە؛ لەبەرئەوەی بەخێرایی ئەنجامەکانی بەرچاو ناکەون.

ئەنجامدانی کارەکان لەلایەن خودی بەڕێوەبەرەوە، یەکەمجار وا دێتە بەر چاو، لەچاو فێرکردنی کارمەندێك، تا ئەنجامی بدات، ئاسانتر بێت، بەڵام لەجێی ئەوەی تەنها جارێك کارمەندێك فێر بکاتو ببڕێتەوە، دواتر دەبێت هەمان کار، هەزار جارو هەزار بار بەئەنجام بگەیەنێت.

بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، کاتێکی زۆر بۆ گەشەپێدانی کارمەندەکانی تەرخان دەکات. بەجۆرێك کە زۆربەی شارەزاییەکانی دەگوازێتەوە بۆیان؛ هەتا لە پەرەپێدانی تواناو بەهرەکانیان، هەروەها لە پلەبەرزکردنەوەیاندا، یارمەتییان بدات.

بێگومان کارمەندەکان، خۆشییان لە گەشەو پەرەسەندن دێتو حەز دەکەن خۆیان وەها ببیننەوە، کە هەموو ڕۆژێك، شتێکی نوێ فێر دەبن، بە هەمان شێوەش چاو بۆ پلەبەرزکردنەوە دەگێڕن.

وەك بەڕێوەبەرێك، فێرکردنی کارمەندەکانت، یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرشانت.. بەڵام گەر لەترسی ئەوەی یەکێکیان تێت بپەڕێنێتو سەرتر بچێتو هەڕەشە لە ئایندەی پیشەییت بکات، یان نەبادا فێر ببنو بۆ کۆمپانیایەکی دی بگوێزنەوە، پشتگوێت خستنو وەلاتنان؛ ئەوا لێت ڕوون بێت، چارەو دەرەتانێکت نییەو هەر لەدەستیان دەدەیت.

دەبێت لێرەدا ئەوەت لە بیروهۆشدا بێت: ئەو بەڕێوەبەرەی جێنشینێك کە شایستەو پێویستە بۆ خۆی ڕادەهێنێتو باری دەهێنێت، دەبێت بە بەهێزترین پاڵێوراو بۆ پلەبەرزکردنەوە؛ لەبەرئەوەی کەسێك دەبینێتەوە، لە پاش چوونی، جێگەکەی بگرێتەوە.



ن: عبدالله العثمان
و: جەلال عەبدوڵڵا



# کاری کەمو ئەنجامی مەزن

## ٥٠ ئامۆژگاری بۆ دەستکەوتی گەورە..

**١٥- بەسەر وشەی (نەخێر)دا زاڵ بە.**

زۆر لە خەڵکی تووشی بێئومێدیو دڵگرانی دەبن، کاتێك پێیان دەوترێت: (نەخێر)، یان وەڵامی نەرێنیوەردەگرن، دەبێت ڕێگەی خۆت ڕاست بکەیتەوەو بەردەوام بیت لە هەنگاونان بۆ تەواوکردنی ڕێگاکەت، نابێت بکەویتو پارچەپارچە بیت، ئەوە ئاماژەی وەسەرخۆهاتنو بەخەبەرهاتنە، نەك وەستانو ڕەقبوون، کەسی ڕووخاو دەکەوێتو پارچەپارچە دەبێتو هەڵناسێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو بەئاگا دێتەوەو هەڵدەستێتەوە، ڕاستەوخۆ لەدوای کەوتنی، تەپوتۆزی جەستەی دەتەکێنێتو هەنگاوەکانی خێرا دەکات بۆ قەرەبووی ئەو کاتەی کە کەوتبوو. هەرچەندە بەسەر گرفتێکی نوێدا سەر بکەویت، ئەوا ماسولکەکانت بەهێزتر دەبن لەڕێگەی سەرکەوتنندا، بۆ هەڵگرتنی سەرکەوتنی زیاتر.

**١٦- بەرووی بیری نوێدا کراوە بە.**

هەندێ بیروبۆچوونی نوێو جوان هەن، زۆرینەی خەڵکی دژایەتی دەکەن، مرۆڤ دوژمنی کارێکە، کە زانیاریی لەبارەیەوە نییە، هەندێك بیروبۆچوون هەیە ژیانت بۆ ئاسانو فەراهەم دەکەنەوە، شتی نوێ تاقی بکەرەوەو فێر بە، ئەگەر بەکارنەهات؛وازی لێ بهێنەو بیدە دواوە.. باش بوو؛ بەردەوام بە لەسەری، ئەگەر بیرێکی تازەت بۆ هات؛ بەوردی قووڵ بەرەوە تێیدا، ئینجا بڕیار بدە، بەکار دێت، یان نا؟ سەیری بکە ئەگەر بەسوودە وەبەرهێنانی پێ بکە لە کاتدا.

**١٧- خوێندنەوەو زانست.**

کەسی زانا، لە هەزار بەندە کاریگەری زیاترە لەسەر شەیتان؛ چونکە کەسی زانا، بەبەرچاوڕوونی، نوورو یەقین، دامەزراویو بەرنامەیەکی ڕوونەوە لە خودا دەترسێ، بەڵام بەندەی ئاسایی، خواپەرستیەکەی بەحەماسەتو هەڵچوونەوە دەکات، ئەگەر حەماسەتەکەی کەم بێتەوە لە لوتکەوە هەرەس دەهێنێتو بەئاسانی تەرا دەکرێتو بەلاڕێدا دەبرێت، ڕەنگە شەیتان بەندایەتیی تری پێ نیشان بدات، یان ڕێگەیەکی جوانی بۆ ئاماژە بکات، بەڵام لەناوەوە هەمووی تاریکی بێت. زانست بەدەست بهێنە؛ چونکە ڕۆشنکەرەوەی ڕێگایە، بەدووورت دەگرێت لە تاوانو تێکەڵوپێکەڵکردنو نەزانی، کاتی گەیشتن بەڕێگەی خۆشبەختیو سەرکەوتن کەم دەکاتەوە.

**١٨- کەمی بەردەوام.**

خۆشەویست (سەلامی خوای لێبێت) دەفەرموێت: ((کەمی بەردەوام، لە زۆری پچڕپچڕ باشترە))، دڵۆپە ئاوی بەردەوام لەسەر بەردێك، کاریگەریی زۆرترە لە ئاوێکی بەخوڕ، چرکە چرکی کاتژمێر زۆر ناخۆشترە لە زەنگی مۆبایل، ئەوەی بەرد دەشکێنێت، چەندین جار لێی دەداتو لە لێدانێکدا دەیشکێنێت، ئەو تەنها لێدانە بەردەکەی نەشکاند، بەڵکو لێدانە یەك لەدوای یەکەکان شکاندی، کارە بچووکو بەردەوامەکان بەگرنگ وەربگرە؛ چونکە باشترین بەرهەم دەبەخشن.

**١٩- نەخێر.**

لەڕێگە چالاکەکانی تەواوکردنی کار، بریتییە لە تەواوکردنی ئەو کارەی کە بەدەستەوەیە، لەجیاتی وەرگرتنی کاری نوێ، هەوڵ بدە ئەو کارە تەواو بکەیت، کە بڕیارت دابوو تەواوی بکەیت، ئاساییە بەکارە نوێیەکان بڵێیت: نەخێر؛ چونکە ئەگەر بڵێیت: بەڵێ؛ ئەوا کاری پێشتر ئەنجام نادەیتو زیان بەکارە نوێیەکە دەگەیەنیتو مافی خۆی پێ نادەیت، یان دەبێت بڵێیت: نەخێر یان کارەکە دوا بخە، دەزانیت لە تواناتدایە وەری بگرە، ئاگاداربە تا تەواو دڵنیا نەبیت لە ئەنجامدانی بەباشی، وەری مەگرە.

**٢٠- دڵسۆزی.**

ئەگەر دەتەوێت پاداشت وەربگریت لەسەر خەوتنت؛ ئەوا نیەتت پاك بکەرەوە بۆ خودا، بۆ ئەوەی بەتوانا بیت بەسەر گرفتەکانی ژیاندا، دڵسۆزیو نیەتپاکی هۆکاری خۆشبەختیە لە دنیاو دوارۆژدا، هەرکارێك کە دەیکەیت نیەتی لێ بهێنە بۆ خودا، پاداشتی گەورەی لەسەر وەردەگریت، لە هەموو چرکەیەکدا تێکرای چاکەکانت زیاد دەکات، کاتێکی زۆرت بۆ فەراهەم دەکات، خودای گەورە بەرەکەت دەخاتە کارەکانتەوە، پاڵپشت دەنێرێت بۆ هاوکاریتو پاداشتت دەداتەوە.



# پـــلان

سامان کەریم
بەشی پێنجەم

## کۆدی خێزانیو کۆدی تایبەت

بۆ لایەنی تەندرووستی مرۆڤ.

**ژمارەی ئەندامانی خێزان:** ئەم بەشە گرنگی لەوەدایە کە لەو خێزانەدا چەند کەس بوونی هەبێت، ئۆتۆماتیک کۆ دەکرێنەوەو دەنووسرێن، تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە کەسێك دەمرێت، یان جیا دەبێتەوە لەو خێزانە، واتە: (ژن دەهێنێت، یان شوو دەکات)، گرنگی ئەم بەشەش لەوەدایە، کە لە ڕێگایەوە ڕاستەوخۆ ژمارەی دانیشتوان دەزانین لەو ناوچەی نیشتەجێبوونەداو دەتوانین ڕێژەی ئەندامانی خێزان بۆ هەر خێزانێك، بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون، بزانین چەندە، واتە: دەزانین لە چ ناوچەیەك ژمارەی دانیشتوان لەزیادبووندایەو لە چ شوێنێك لە کەمبووندایە، لەچ ناوچەیەك شێوەیەکی وەستاوی هەیە کە هۆکارەکان دەزانینو چارەسەریان دەکەین؟ ئەم بەشەی خشتەکە بەشێکی گرنگی کارەکەمانەو بەپێی ڕێژەی دانیشتوان کار بۆ هەموو بەشەکان دەکەین؛ چونکە تاکو ژمارەی دانیشتوان نەزانین بەشێوەیەکی زانستی؛ ئەوا ناتوانین هەندێ کێشەی هەڵواسراو چارەسەر بکەین.

**پیشە:** پیشەی هەر تاکێکی کۆمەڵگایە بەپێی ئەو کارەی کە ڕۆژانە دەیکات، ئایا کاری حکومییە، یان گرێبەستە، یان کۆمپانیایە، یان کەرتی تایبەتە، یان کاری ئازادە، هەرکەسێك بێکار بوو؛ دەنووسرێت بێکار؛ بۆئەوەی کار بۆ ئەو کەسە بدۆزرێتەوە بەپێی ئەو پسپۆڕییەی کە هەیەتی، یان حەز بە چ کارێك دەکات؛ بۆئەوەی ڕێژەی بێکاری پێ دیاری بکرێتو هەوڵی نەبڕکردنی ئەو دیاردەیە بدرێت. لەم ڕێگایەوە ژمارەی خاوەن کارەکانو بێکارەکان دەزانین، هەروەها دەشزانرێت چەند کەس لە کەرتی حکومین، یان لە کەرتی تایبەتن، یان کاری ئازاد دەکات، نەك بەو شێوازە نازانستییەی کە ئێستا دەوترێت ڕێژەی بێکاری لە پارێزگای سلێمانی لەسەدا (٢)وە، کە نازانرێت بەشێوەیەکی زانستی ئەم ڕێژەیە چۆنو لەکوێوە هاتووە.

**شوێنی پیشە:** ئەو شوێنەی کە کاری لێ دەکات ڕۆژانە، بۆ ئەوەی بزانین هەر شوێنێك حکومی بێت، یان ناحکومی، ڕێژەکان بەپێی دانیشتوانو پێویستی ئەو شوێنە بۆ کارمەند چۆن دابەش بووە.

**گرنگیی (پیشە)و (شوێنی پیشە):**

**یەکەم:** زانینی پیشەکانو کارکردن بۆ ئەو پیشانەی کە کۆمەڵگا پێویستی پێیەتیو تاڕادەیەك لە هەندێك ناوچە کەمن، یان نین؛ بۆئەوەی یەکسانییەك دروست بکەین بۆ هەموو پیشەکان بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون. واتە: پسپۆڕی هەیە لەڕێژەی خۆی زیاترمان هەیە، بگرە بۆ چەند ساڵێکیش پێویستمان پێی نییە، لەهەمان کاتدا پسپۆڕی هەیە پێویستی زۆرمان پێی هەیەو کارمەندی ئەو بوارەمان کەمە. واتە: ئەم

لەم ژمارەیەدا دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکەمان:

| | کێش | باڵا | ژمارەی ئەندامانی خێزان | پیشە | شوێنی پیشە |
|---|---|---|---|---|---|
| + | | | | | |

**کێش:** ئەم بەشەش گرنگی خۆی هەیە؛ بۆئەوەی بزانین بەپێی تەمەنەکان، کێشی هاوڵاتیان چۆن دابەش بووە، کە لەڕووی تەندرووستییەوە گرنگیی خۆی هەیە؛ چونکە بەزانینی ئەم بەشە، دەتوانین پلانی وەرزشیی گرنگ دابنێین بەپێی شوێنی نیشتەجێبوون؛ بۆئەوەی وڵات لە دەردی کێش زۆری ڕزگار بکەین. بەدەر لەوەش بۆئەوەی بزانین دانیشتوان بەسەر چ ڕێژەیەکی کێشدا دابەشبوون، قەڵەون، لاوازن، مامناوەندین، ئاماری ئەم لایەنەش بزانین.

**باڵا:** ئەم بەشەش گرنگیی خۆی هەیە؛ تاکو بتوانین بۆ هەندێك شوێن، وەك لایەنی سەربازیو یارییە وەرزشییەکانو چەندین بەشی تر، کە ئەم بەشە دەیگرێتەوە، زانیاریی کەسیمان لەبارەیەوە هەبێت، هەروەها باڵا پەیوەندی بە کێشیشەوە هەیە

پلانە پەیوەندی لەگەڵ خوێندنی باڵاشدا درووست کرد، بەوەی کە بەپێی پێویستی لەزانکۆدا، خوێندکار وەردەگرین.

**دووەم:** زانینی ڕێژەی بێکاری لەناو کۆمەڵگادا بەشێوەیەکی زانستیو کارکردن بۆ نەهێشتنی، بەپێی خواستی هاوڵاتیو پسپۆڕیی کەسەکان. لەبەرئەوەی تاکو ئێستا، ئەم ڕێژەیە بەتەواوی نازانرێت، بۆیە حکومەت چارەسەری ئەم کێشەیەی پێ ناکرێت تاکو ئەم ئامارە بەڕاستی نەزانێت. واتە: دەزانیت ڕێژەی بێکاری بەپێی ئەو پسپۆڕییانە چەندە، کە لەکۆمەڵگادا هەیە. واتە: لەو ڕێژەیە چەندی (کرێکارە، یان مامۆستایە... هتد)، واتە: کۆی بەشەکانی بێکاری دەزانیت.

**سێیەم:** دەزانین هەر شوێنێك چەند کەس تێیدا کار دەکات شوێنەکە حکومی بێت، یان ئەهلی، دەزانین چەند کادرمان پێویستە بۆ ئەو شوێنانە؟ چونکە شوێن هەیە لە کادری خۆی زیاتری تێدایە کە پێویستە چارەسەر بکرێت. واتە: ئەم پلانە دەبێتە هۆی دیاریکردنی میلاکی ڕاستەقینەی هەموو دامودەزگاکان. بۆ نمونە یەکێك لەوەزارەتەکان (٤٠٠) کارمەندی هەیە، بەڵام پێویستی بە (٢٠٠) کارمەندە، واتە: (٢٠٠) کارمەند زیادیە لەو وەزارەتە بۆیە دەبێت بەپێی شایستەیی لەو شوێنەدا (٢٠٠) کارمەندی بەتوانا دابنرێن ناپێویستەکان لاببرێن، یان بخرێنە شوێنی تر بەپێی لێهاتوویی لەو بوارەی کاری تێدا دەکات.

**چوارەم:** خاڵێکی گرنگ ئەوەیە، هەر کات شوێنێکی بەتاڵت هەبوو بۆ کارکردن، خۆت کەسەکان بەپێی پسپۆڕییان بانگ دەکەیت بۆ دامەزراندیان، نەك بەو شێوازەی ئێستا کە فۆڕم دەدرێت بەجارێك خەڵکێکی زۆر کۆ دەبێتەوە، بەم پلانە زانیاریی کەسی هەموو هاوڵاتییەکت لا دەبێتو بۆ هەر شوێنێك کێت پێویست بێت، ڕاستەوخۆ دای دەمەزرێنیت، نەك وەك ئەوەی ئێستا ئەنجام دەدرێت.

**دەگەڕێینەوە سەر خشتەی سەرەکیو چەند بەشێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکەمان:**

| شوێنی نیشتەجێبوون | جۆری خوێن | بڕی بودجە | |
|---|---|---|---|
| | | | + |

**بڕی بودجە:** لەڕێگەی ئەم بەشەوە، دەزانین بودجەی هەر خێزانێك چەندە، دەزانین ئایا خێزان بەو بڕە بودجەیە بەڕێوە دەچێت، یان نا؟! بۆیە ئەم بەشە گرنگیی لەوەدایە، لەم ڕێگایەوە داهاتی خێزانو تاکی کۆمەڵگا دەزانین چەندە؟ لەم ڕێگایەوە کار بۆ ئەو خێزانانە دەکرێت، کە بودجەکەیان بەشی پێویستی ژیانیان ناکات، بۆ ئەم کارەش، یەکەم خاڵ هەوڵی نەهێشتنی کرێنشینی دەدەین، کە ئەوەش لەپلانی ئاوەدانکردنەوەدا بەڕوونی باسی لێوە دەکەین، کە چۆن چارەسەری کرێنشینی دەکەین، لەگەڵ نەهێشتنی کرێنشینی، داهاتی خێزان بە ڕێژەیەکی بەرچاو بەرز دەبێتەوەو بوژانەوەی ئابووری درووست دەبێت، بەپێی پێویستی داهات بۆ خێزانە کەم دەرامەتو هەژارو کرێنشینو بێوەژنەکان دیاری بکرێت؛ بۆئەوەی ناچاری قورسیی ژیان نەبن.

هەروەها خەرجیی خێزانەکان دەزانین، واتە: دەزانین ساڵانە دانیشتوان چەند خەرجیان هەیە؛ چونکە پلانێکمان هەیە بۆ هاوڵاتی، کە چۆن خەرجی ڕۆژانەی خۆی بکات کە زۆر گرنگە، لەبەرئەوەی چەندین خێزان هەیە، بڕە بودجەیەکی زۆر بەشی ناکات، بەهۆی زیادە مەسرەفی ناپێویستەوە.

**جۆری خوێن:** لە ڕێگەی ئەم بەشەوە، جۆری خوێنی هەموو تاکێکی کۆمەڵگا دەزانین، کە بۆ پلانی تەندرووستی، گرنگیی خۆی دەبێت.

**شوێنی نیشتەجێبوون:** پێویستە لەسەر هەموو سەرۆکخێزانێك کە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی بەتەواوی بنووسێت؛ چونکە یەکێکە لە گرنگترین بەشەکان، تەواوی ئەم پلانەش لەم ڕێگایەوە جێبەجێ دەکرێت؛ لەبەرئەوەی زۆرینەی ئامارەکان، پەیوەندی بەزانینی شوێنی نیشتەجێبوونەوە هەیە، لە ڕێگای ئەم بەشەوە، دەتوانین مامەڵە لەگەڵ زۆربوونو کەمبوونی دانیشتواندا بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش،

| پارێزگا | ناوەند، قەزا، ناحیە | سنوور | ناو، یان ژمارەی گەڕەك | كۆڵان | خانوو |
|---|---|---|---|---|---|
| سلێمانی هەولێر دهۆك | ناوەند ناوی قەزا، یان ناوی ناحیە، یان گوند | ناوەند، ناوچەکان، گەڕەکەکان | هەندێك شوێن ناوی گەڕەکە، هەندێك ژمارەیە | ژمارەی كۆڵان | ژمارەی خانوو |

بەم زانیارییانە، شوێنی نیشتەجێبوونی هەر خێزانێك دەزانین، کە بۆ یەکجار پڕ دەکرێتەوە؛ تاکو لەو شوێنەدا بمێنێتەوە، هەر کات ئەو شوێنەی جێهێشت، ئەو کات تەنها شوێنی نیشتەجێبوونی تازە دەکاتەوەو هەموو زانیارییەکی تری، یان وەك خۆی دەمێنێتەوە، یان گۆڕان لەچەند زانیارییەکی کەمدا ڕوو دەدات، هەروەها مەبەستمان لە شوێنی نیشتەجێبوونیش بەشێوازی هەشت ژمارەیی دەنووسرێت، وەك پێشتر ئاماژەمان پێ دا.

**گرنگی شوێنی نیشتەجێبوون**

گرنگیی ئەم بەشە، لەم چەند خاڵەدا ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم:** لەڕێگای ئەم بەشەوە دەزانین لە چ شوێنێکدا قەرەباڵغی دانیشتوان درووست بووە، تاکو چارەسەری بکەین.

**دووەم:** لە ڕێگای ئەم بەشەوە، دەزانین ژمارەی دانیشتوان بە چ ڕێژەیەك بەسەر ناوچەکاندا دابەشبوون، کە ئەم خاڵە زۆر سوودی لێ دەبینین بۆ زۆر بوار، لەوانە: سوودی لێ وەردەگرین لە ڕووی ئاوەدانکردنەوە، لە ڕووی تەندرووستی، لە ڕووی پەروەردەیی، کاتی هەڵبژاردن، وەك ئەوەی کاتێك دەڵێین دانیشتوانی سلێمانی **1,500,000** یەك ملیۆنو پێنج سەد هەزار هاوڵاتییە، بەپێی ئەم پلانە، دەزانین بەسەر ناوەندی سلێمانیو یانزە قەزای گەورەکەدا، ئەم ژمارەیە چۆن دابەش بووە.

**سێیەم:** لەڕێگای ئەم بەشەوە، دەزانین چ شوێنێك پێویستی بە خزمەتگوزاری هەیە (هەموو جۆرەکانی خزمەتگوزاری)، ئەولەویەت دەدەین بەو شوێنانەی کە ژمارەی دانیشتوانیان زۆرترە.واتە: ژمارەی دانیشتوان پەیوەندی هەیە بە لایەنی خزمەتگوزارییەوە بەپێی پێویستترین شوێن.



# گەورەبوونی شارەکانو کاریگەرییان لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان

وەهاب حەسیب محەممەد
بینگۆڵ/ تورکیا

لە لایەك لە ئەنجامی جەنگ لە نێوان ئێرانو عێراق، بە دیوێکی تردا لە ئەنجامی سەرسەختانەی بەرگریی کورد بەرانبەر بە ڕژێم، حکومەت دەستی کرد بە ڕووخاندنو تێکدانی گوندو شارەدێکانی کوردستان، ئەنجامی ئەم سیاسەتە، خراپ بەسەر کوردستانو دانیشتوانەکەیدا شکایەوە، لە ئەنجامدا: بنەماکانی ئابووری کوردستان خاپوور کرا، دانیشتوانەکەی لە زێدی بابوباپیرانیان هەڵکەندرانو بەناچاری لە ئۆردوگاو شارەکاندا کۆ کرانەوە.

ئەو کارە کۆمەڵێك ڕەهەندی جیاوازی لێ کەوتەوە، دیارترینیان: * فراوانبوونی شارەکانە، ئەو کارەش کاریگەری بەسەر تەواوی ژیانی خەڵکەوە هەیە، زەقترینیان لایەنی کۆمەڵایەتییە؛ چونکە کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان بەگشتی لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، چەندەها ڕایەڵەی جیاواز پێکەوەی بەستوون، ئەورۆ ئەو ڕایەڵانە شل بوونەتەوەو کار بەو شێوەیە بڕوات، ڕەنگە ئەو پەیوەندییانە زیاتر بچووك ببنەوەو بچنەوەیەك، لە ئەنجامدا کاریگەرییەکانی زیاترو قەبەتر دەبن.

* پێشکەوتنی ژیان بەگشتی، هۆکاری جیاوازی تێکەڵ بەم دیاردەیە کردووە، بەڵام لێرەدا تەنها وتووێژ لەسەر گەورەبوونی شارەکانو کاریگەرییان لەسەر دانیشتوان دەکەین لە ڕووی کۆمەڵایتییەوە.

### فراوانبوونی شارەکان چییە؟

بریتییە لە: گەورەبوونی شارێك لەسەر حسابی زەویو ناوچەکانی دەوروبەری، دەستەواژەکە گشتییە، ئاماژەیە بۆ فراوانبوون بەشێوەیەکی هێواشو لەسەرخۆ، هەروەها ئەو کارە هۆکاری زیاتری خزمەتگوزارییە؛ چونکە ناوچە دێهاتنیشەکانی دەوروبەری شارەکان، پێش دەکەونو هۆکارەکانی گواستنەوە تێیاندا زۆر دەبێت.

ناساندنی چەمکی شارنشینی، زۆر ڕوون نییە؛ چونکە بۆ ناساندنو دیاریکردنی واتاکەی بە شێوەیەکیورد، وتووێژو قسەی زۆر هەڵدەگرێت. هەندێك پێیان وایە بنیاتنانو هەڵتۆقینی شارێکی پێشکەوتووە، کە خواستی لەسەر خزمەتگوزاریی زۆرە، بڕێکی دیکە دەبێژن: پێوانەکردنی شارەکەیە بە ژمارەی خانووەکانی، کەسانێکیش بە گوێرەی لامەرکەزیەت ئەو چەمکە پێوانە دەکەن. "واتە: فراوانبوونی کۆمەڵانی دانیشتوان، بێئەوەی لەو فراوانبوونەدا بگەڕێنەوە بۆ ناوەندی شارەکان، هەمان کات لایەنی تەکنیکیو خزمەتگوزاری تیادا دەستەبەر کرابێت"

### سرووشتی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی چییەو چۆنە؟

کاتێك کەسێك لە کۆمەڵگادا دەژیو بەریەکەوتنی لەتەك کەسانی دیکەدا دەبێت، ئەوە تێکەڵاوبوونێکی فیسۆلۆجی نییە، بەڵکو تێکەڵبوونی ڕەفتارو دیاریکردنی ڕەفتارەکانییەتی لە ڕێگای پەیوەندیکردنەوە، ئەو پەیوەندییە دەشێت گفتوگۆ، ڕاگۆڕینەوەو لێگەیشتنی هاوبەش بێت، واتە: بە شێوەی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ ئەو تێکەڵبوونە ڕوو بدات، وەك پەرتووك، وێنەو موزیكو...هتد.

بەم شێوەیە کەسەکان لە کۆمەڵگادا تێکەڵ دەبنو ڕۆڵی یەکتر پەسەند دەکەنو یەکتری تەواو دەکەن.

ڕێکخستنی کۆمەڵگا، هەڵقوڵاوی کارلێکی کۆمەڵایەتییە؛ چونکە ئەو کارلێکە کاریگەریی گەورەی لەسەر کۆمەڵگا هەیە، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەگشتی فەرمیو نافەرمی، ڕووکەشو قووڵ، ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، گشتی پەیوەستە بەکارلێکی کۆمەڵایەتییەوە. نموونەی ئەو ئالیکاریانە: هاوکاری، لێکگەیشتنو خۆگونجاندن، نوێنەرایەتیو...هتد.

یەکێك لەو تیۆرە نوێیانەی کە شیکاری فراوانبوونی شارەکانو کاریگەرییان لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی دەکات، تیۆرەکەی (لیو کلاسن)ە، فروانبوونو کاریگەری شارەکان بۆ چوار قۆناغ دابەش دەکات، تا ڕادەیەکی زۆر، شیکارییەکانی (لیو کلاسن) لەتەك ئێستای شارەکانی کوردستان یەك دەگرێتەوە:

١. بەشێوەیەك فراوانبوونی پیشەسازی، هۆکاری گەشتی لادێنیشینانە بۆ شارە گەورەکان" بێگومان هۆکارەکان زۆرو پێکداچوون" دواتر دانیشتوانی شارەکان، بەشێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات، لە بەرانبەردا ژمارەی دانیشتوانی لادێکان، دەدات لە کەمایەسی.

٢. قۆناغی کۆچکردن بۆ دەوروبەری شارەکان: کاتێك ئەو کۆچە دەست پێ دەکات کە داهاتی تاکەکان بەشێوەیەکی دیار هەڵکشێت، هۆکارەکەشی زیادبوونی کرێی دەستە، لەگەڵ زۆری داهاتدا هاوکات، بە هۆی گرانی کرێی نیشتەجێبوونو بەرزبوونەوەی نرخی پێداویستییەکان، شاریش ڕەونەقی خۆی لەدەست دەدات، لەم کاتەدا خاوەن داهاتە زۆرو مامناوەندەکان ڕوو لە دەورووبەری شارەکان دەکەن، هاوکات ناوەندی شاریش لە چالاکی بازرگانیدا کورت دەبێتەوە. لەم کاتەدا خانوو باڵەخانە کۆنەکان" ئەوانەی کە

بۆ ماوەیەکی زۆرە، بە نرخێکی کەم بەکرێ دروانو خاوەنەکانیان پشتگوێی خستوون" دەست دەکرێت بە ڕووخاندنیان، دواتر دەکرێن بە کۆگاو نووسینگە، یاخود هەر پێداویستیەکی چالاکی بازرگانی. بیرمان نەچێت بە هەمان شێوەی شارەکان کرێی خانوو، باڵەخانەو شوێنی نیشتەجێبوونی لەو ناوچانەدا بەرز دەبێتەوە، ناچار خەڵك بۆ نیشتەجێوون، ڕوو لەشارە گچکەکان دەکەن. ئەم دیاردەیە بە ئاشکرا لە شارە گەورەکانی هەرێمدا دەبینرێت.

٣. قۆناغی هەڵوەشانەوەی شار: ئەم قۆناغە تەواوکەری قۆناغی پێشووە، لەم کاتەدا دانیشتوانی شار ڕوو لە کەمی دەکات، هاوکات نزیکی شۆێنکار لە شوێنی نیشتەجێبوونەوە گرنگییەکی نامێنێت؛ چونکە ئەو کات بڕینی ڕێگای کارو نزیکی شوێنکار، هۆکارەکانی گەیاندن نزدیکی دەکەنەوە، هەروەها بڵاوبوونەوەی خزمەتگوزاری گشتیو گەشەکردنی شارەدێکانو لادێکان هاوکاری ئەم دیاردەیەن.

٤. قۆناغی بنیاتنانەوەی شار: لەم قۆناغەدا دووبارە دەست دەکرێتەوە بە بنیاتنانەوەی شار، بەشێوەیەك لە تەنیشت خانووە کۆنو دارماوەکاندا، باڵەخانەی هەوربڕ دەبینرێت، لە کاتێکدا دانیشتوانی ئەم دوو جێگایە، دوور لە یەکدی ژیان بەڕێ دەکەنو هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە، جیاوازن لە شێوازی بیرکردنەوە، هەڵسووکەت، تەنانەت تامو چێژیان بۆ خۆشییەکانی ژیان جیاوازە.

لێرەدا خانووە کۆنو دارماوە پشتگوێخراوەکان" تەنانەت ئەو جێگایانەی کەوەك شوێنەوار ڕۆژگارێك چاویان تێبڕاوە" دەڕووخێنرێنو دووبارە بنیات دەنرێنەوە، بەڵام بە شێوازێکی نوێو سەردەمیانە" دەکرێت زۆر جێگای سلێمانی، هەولێرو کۆیە بە نموونە، بۆ ئەم دیاردەیە تەواشا بکرێت.

## پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لە سایەی شارە گەورەکانداو کاریگەرییەکانی لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی:

أ. نەمانی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی گشتی لە نێوان ئەندامانی خێزانو کۆمەڵگادا:

به شێوەیەکی بەرچاو، ئەم دیاردەیە لە نێوان دانیشتوانی شارو بەتایبەت لە نێوان دەرهاوسێکاندا هەستی پێ دەکرێت.

(ئیبن خەلدون) شەش سەدە بەر لە ئەورۆ، ئاماژەی بۆ ئەم دیاردەیە کردووە، ئەو دەڵێت: شار خەسڵەتی خۆی بەسەر دانیشتوانیدا دەسەپێنێت، کاریگەری لەسەر ڕۆشنفکرییان، چالاکیی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیان دادەنێت، هەروەها شار بەشێوەیەکی خێرا فراوان دەبێتو ژمارەی دانیشتوانی هەڵدەکشێت، هاوشێوەی ئەم دیاردەیە، لە نێوان شارەکاندا دەتوانرێت ببینرێت، هەرچی ناوچە دێهاتنشینەکانە، دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تێیدا، تاڕادەیەك جێگیرو پارێزراون.

لەتەك ئەوەی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان، بەبەردەوامی زیاد دەکات، بەڵام پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر پاشەکشە دەکەن؛ چونکە لە ئەنجامی فراوانبوونی شارەکاندا، دانیشتوان پێویستە لە سەریان چەندین ڕۆڵ لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بگێڕن، ئەوکارەش وادەکات بەگران بتوانن پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پێکبهێنن. یاخود ئەگەر سەرکەوتووش بن لە پێکهێنانی ئەو پەیوەندییانەدا؛ ئەوا پەیوەندییەکە تەمەنی کورتە.

لێرەدا دانیشتوان تەنها لە ناو ئاسانسوارو خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا چاویان بە یەکدی دەکەوێت، توێژینەوەیەك پیشانی داوە: لە (٢٠٪)ی دانیشتوانی گەڕەکێك، هیچ پەیوەندییەکیان لەتەك ئەوانی تردا نییە! هەروەها هەمان توێژینەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە (٣٠٪) دانیشتوانی باڵەخانەیەك، ئاگاداری یەکتر نین!

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا ڕەنگە هۆکارێکی دیکە کاریگەری هەبێت، ئەویش پێویستنەبوونی خەڵکییە بە یەکتر، ئەگەر ئاوڕێك بدەینەوە، دەبینین چەندین وتەو زاراوەی جوانی وەك: کاسەدراوسێتی...هتد، بوون بە ڕابوردوو، بەشێك لە کەلتوور، بەداخەوە.

## چەند پێشنیارێك بۆ چارەسەرکردنی ئاریشەکان:

پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، شارە گەورەکان پێکهاتەی دانیشتوانو پێکهاتەی کۆمەڵایەتییان ئاڵۆزە، پەیوەندیی کۆمەڵایەتی تێیاندا سستە، هۆکارەکەی جیاوازییە لە داهات، ڕۆشنبیری...هتد، هەر شارنشینێك هەوڵ دەدات ئەوەی دەیزانێت بە ڕاستی پیشان بداتو پارێزگاری لێ بکات، هۆکارەکەشی ئەوەیە هەلێکی گونجاو نییە لە ڕووی کاتو شوێنەوە، ئەو خەڵکە بەیەك بگەیەنێت.

١. فراوانکردنی مزگەوتو ئەو جێگایانەی نوێژی تێدا دەکرێت (مصلى): کاریگەری مزگەوت بۆ گشت باوەڕدارێك دیارە، ئەوی زانراوە پێشتر باوەڕداران، تەنها جێگای گردبوونەوەیان ماڵی خودا بووە، لە مزگەوتەکاندا هەموو توێژوچینێك دەتوانن ڕۆژانە یەکتری ببینن‌و ڕۆڵی کۆمەڵایەتی خۆیان ئاڵوگۆڕ بکەن، لە کاتێکدا شارە قەرەباڵغەکانو باڵەخانە بەرزەکان، ئەو ڕۆڵانەیان لە دانیشتوان سەندۆتەوە.

٢. درووستکردنی بنکەی کۆمەڵایەتی لە گەڕەکاندا:

توێژینەوەکان ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە لە تواناددا نییە گەشەکردنی شارەکان لە ئاستێکدا ڕابگیرێت؛ چونکە بەردەوام دانیشتوان لە دێهاتەکانەوە ڕوو لە شارەکان دەکەن، هەروەها تێکدانی بە بەرنامەی گوندەکانی کوردستان، کارێکی کردووە تا دووسەدەی دیکە، ئاسەواری بەسەر کۆمەڵگای کوردییەوە بمێنێت." بە بۆچوونی حوسین عەزیزی نووسەر".

کەسێك کە ڕوو لە شارێك دەکات، تەنها بە جەستە نابێتە بەشێك لە شار، بەڵکو بە ڕوح، بە کەلتوورو...هتد، بەشێکی ئەو جێگایە پێك دەهێنێت، هاوکات کاتێك بەریەککەوتن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ڕوو دەدات، چەندین ئاریشەی جۆراوجۆر سەر هەڵدەدەن، دەکرێت ئەم بنکانە بکرێن بە ناوەندێك بۆ لێکگەیشتنو چارەسەری کێشەکان، هاوکات جێگایەك بن بۆ زیندووکردنەوەی ڕۆحی کۆمەڵایەتیو گیانی هاریکاری لە نێوان دانیشتواندا.

وەك ئەوەی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا دەبینرێت، بوونی چوارهەزار ناوەند لە وڵاتێکی وەك بەریتانیادا، چوار ملێون ئەندامیان هەیەو دووسەدو بیست هەزار کارمەند کاری تێدا دەکەن، دەکرێت سوود لەم تاقیکردنەوانە وەربگیرێتو کاریان لەسەر بکرێت.

٣. دۆزینەوەی ڕکابەر بۆ شارەگەورەکان:

گرنگیدان بە ژێرخانی شارە بچووکەکان، شارەدێکانو دێهاتەکان، تا دانیشتوان بەو شێوەی گەڕەکیانە، ژیان بە سەربەرنو بۆ گشت پێداویستییەك نەگەڕێنەوە بۆ شارە گەورەکان، لە هەرێمی کوردستاندا کردنەوەی چەندین بەڕێوەبەرایەتیو زانکۆ، بنیاتنانی یەکەی نیشتەجێبوون دەکرێت بە کارێکی بە نرخو بە چاوێکی ڕێزەوە تەواشا بکرێت، بێگومان لە داهاتوودا چەندین کێشەو ئاریشە لە ڕێگایانەوە چارەسەر دەکرێن.

سەرباری ئەو هۆکارانە، دەکرێت لایەنی تەلارسازی شارەکان، کردنەوەی دایەنگە کە ڕۆڵی کۆمەڵایەتی تێدا بنیات بنرێت، وەك هۆکار لە چارەسەری ئەم کێشەیەدا سەیر بکرێن.



# نهێنییەکانی سەرکەوتن لە بازاڕسازیی ڕایەڵەدا

## (نێتۆرك ماركێتینگ)

بەشی سێیەم

## سەرکەوتن یان شکست لە ۹۰ ڕۆژی یەکەمدا

**هەڵبژاردنی کارگە:**

بەبێ زیادەڕەوی، هەزاران کارگە هەیە، کە لەڕێگەی ئێن ئێم سەرقاڵی فرۆشتنی کاڵاو خزمەتگوزارییەکانیانو هەریەکەیان خوازیاری سەرکەوتنە بەسەر کارگە هاوتاکانی خۆیدا، هەڵبژاردنی کارگەیەکی درووستو باوەڕپێکراو بۆ هاوکاری، زۆر جێگای گرنگی پێدانە، چونکە ئێوە لە بڕیارەکەتاندا بەدوای ئامانجێکی درێژخایەنەوەنو زۆر نائومێدکەرو تەنانەت قەیراناوی دەبێت؛ ئەگەر دوای ماوەیەك بزانین، کە چالاکییەکانی کارگەی جێمەبەستمان وەستاون، یان ئەوەی کە کارگەکە شێوەی دانەوەی قەرزی گۆڕیوە، یان ئەوەی کە پێکهاتەی هەرەمیی لێك هەڵوەشاوە. ئەم پێوەرانەی خوارەوە یارمەتیتان دەدەن بۆ بڕیاردانێکی مەعقولو بەسوود:

**١- پێشینەی کارگەو ڕابوردووی کارەکەی:**

گونجاوە کە کارگەیەك هەڵبژێرین، بەلایەنی کەمەوە ٥ ساڵ پێشینەی کاری سەرکەوتووی هەبێت.لەبارەی ئەو سەرمایەی پێشەکی کە بە کارگەکەی دەدەیت، بەرهەمە وەرگیراوەکەی ئەو سەرمایەیەو سووددانی کارگە بکۆڵنەوە. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە زۆرینەی ئەو کارگانەی کە بەشێوازی ئێن ئێم کاڵا، یان خزمەتگوزارییەکانیان دەفرۆشن، لە ٥ ساڵ زیاتر بەردەوامییان نابێت. ئەڵبەتە ئەمە بەو مانایە نییە کە کارگە تازەدامەزراوەکان باش نین. لە ئاوا بارودۆخێکدا لێکۆڵینەوەو پشکنینی زیاتر ئەنجام بدەن.

**٢-بەڕێوەبەرانی کارگە:-**

پێویستە سەنگی سەرۆکو بەڕێوەبەرانی کارگە لەبەرچاو بگیرێت. ئایا بەڕێوەبەرانی کارگە لە بازرگانی ئێن ئێم ئەزموونێکیان هەیە؟ ئایا ئێن ئێم بنەڕەتترین چالاکیی بازرگانی کارگەیە؟ ئایا کارگە لە چالاکییە بازرگانییە ناپەیوەندەکانیشدا دەستی هەیە؟ باش وایە کە کارگەیەك هەڵبژێرین کە تیمێکی بەڕێوەبەرێتی لێزانی هەبێتو چالاکییەکانی تەنها لە ئێن ئێم کۆ بووبێتەوە.

**٣-ئەو بەرهەمو خزمەتگوزارییانەی کە کارگەکە نمایشیان دەکات**

لەم تایبەتمەندییەدا باشتر وایە ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێن:

- جۆراوجۆری بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان.
- کاڵا بەکارهێنراوەکان کە هەمو ڕۆژێك پێویستن.
- گەرەنتی دانی پارە.
- نمایشی بەردەوامی بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان.
- بەرهەمگەلێك کە بۆ تەندرووستیو ژینگە زیانبەخش نەبن.
- نرخی بەرهەم.
- خزمەتگوزارییەکانی دوای فرۆشتن.

**٤-پلانی گەڕاندنەوەی قەرزی کارگە:**

پێویستە پلانی گەڕاندنەوەی قەرز، بۆ هەموان سەخاوەتمەندانەو داوەرانە بێت بە کڕیارانی چالاك، تەنها لەسەر بنەمای هەوڵو کۆششیان (نەك پێوەرگەلی تر) پاداشت بدات.

**٥-چاودێری:**

پێویستە کارگە لە ڕووی فێرکردنو بەدیهێنانی جووڵەوە، چاودێریگەلی پێویست بەکار بهێنێت.

ئەم چاودێرییانە بریتین لە: خولی فێرکردن، سیمینارەکان، کارگە جۆراوجۆرەکان، پێویستی فێرکردن لە ڤیدیۆو شتی تر. پێویستە پێکهاتەیەکی درووستو تۆکمە بۆ نمایشو گواستنەوەی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان هەبێت. هەروەها پێویستە عەمبار، یان ناوەندی ئاسانکەری نمایشی کاڵاو خزمەتگوزارییەکان هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا گرنگە کە کارگە گوزارشی درەختئاسای ژێر لقەکانو گوزارشی سەرپشکییەکانو پاداشتەکانی کڕیاران بەردەوام لە ئیختیاری ئەواندا دابنێت.

**٦-نێودەوڵەتیبوون:**

ئایا ئەو کارگەیە لە وڵاتانی تریشدا چالاکی دەکات؟ ئایا کڕیاران دەتوانن بازرگانییان لەسەر ئاستی جیهان فراوان بکەن؟

ئەم هۆکارە، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە مەبەستی فراوانکردنی ژێر لقەکانیان بۆ وڵاتانی تر هەیە گرنگە. بە بەرەکەتی بوونی ئینتەرنێت، ئێستا بەرێکخستنی بازرگانی جیهانی لە ڕێگەی ئێن ئێم بەئاسانی دەکرێت.

### ٧-یاساییبوون:

ئایا کارگەکە لەلایەن پێگە خاوەن ڕا پەیوەندیدارەکانەوە بەشێوەیەکی یاسایی دانی پێدا نـراوە؟ ئایا کارگەکە خاوەنی مۆڵەتی باوەڕپێکراوی فرۆشتنی ڕاستەوخۆیە؟ ئایا سەرۆکەکانی کارگەکە، پـەیـڕەوی لە یاساو ڕێسای ئـەو وڵاتانە دەکـەن کە چالاکییان تێدا دەکەن؟ ئایا کارگەکە لەلایەن"یەکێتی فرۆشتنی ڕاستەوخۆ" لەو وڵاتـەی کە کارگەکە تێیدا چالاکە دانی پێدا نـراوە؟ ئەمانە هەموویان هۆکارگەلی گرنگن کە پێویستە لە بەرچاو بگیرێن؛ چونکە بەردەوامی چالاکی کارگە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ پەیوەندی بەم هۆکارانەوە هەیە.

### سەرپشکیی نێتۆرکی مارکێتینگ:

ئێن ئێم بەهۆی ئەو سەرپشکییە زۆرەی کە بە بـەراورد لەگەڵ بازرگانی کۆندا هەیەتی، لە پێوەری سەرکەوتنێکی زۆر بەرز بەهرەمەندە. دەتوانرێت سەرپشکییە زۆرەکانی ئێن ئێم لەمانەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە:

١- نیازمەندی سەرمایەی سەرەتا زۆر کەمە.

٢- بێمەترسییە.

٣- هیچ جـۆرە پسپۆڕییەك، یـان ئەزموونێکی تایبەتی پێویست نییە.

٤- سەرچاوەیەکی باشە بۆ بەدەستهێنانی داهاتی چەند لایەنە؛ چونکە دەتوانێت بەشێوەی پارت تایم ئەنجام بدرێت.

٥- چاودێری هەمەلایەنەی سیستم بۆ ئێوەیە. ئەم چاودێرییە هەم لە لایەن کارگەو هەم لە لایەن بەشەکانی سەرەوە دەکرێت.

٦- وزەی داهاتێکی بێشوماری هەیە.

٧- توانای بەدەستهێنانی دەرامـەتـی ناچالاك (Passive income) بە تاك دەدات. ئەگەر تاك کۆمەڵەیەکی سەرکەوتوو بسازێنێت، دوای ئـەوە کۆمەڵەکە بەبێ ئامادەبوونی خۆیشی بەردەوامی بە گەشەی دەدات. داهاتی ئەو هەمیشە بەردەوامی دەبێتو دەتوانێت بە میرات بە هاوسەرەکەی، یان منداڵەکانی بگات.

٨- دەرفەتگەلی گەشتیاری دەخاتە بەردەس؛ چونکە زۆرینەی ئەو کارگانەی کە بە شێوازی ئێن ئێم چالاکی دەکەن، بۆ کڕیارە چالاکەکانیان پلانی گەشتی تەشویقی لەبەرچاو دەگرن.

٩- لە کاری ئێن ئێم پلانگەلی زۆر بۆ سوپاسگوزاریو ڕێز لێنان لە کڕیارانی چالاك هەیە. کارگەکان بە زیادبوونی چالاکی سەرکەوتووی ئێوە ڕێزلێنانو سوپاسی ئێوە دەکات.

١٠- ئێن ئێم دەرفەتگەلی زۆر بۆ گەشەو کەماڵی تاك فەراهەم دەکات. ئێوە زۆرینەی خولەکانی فێرکردنو بەرنامەکانی هاندان دەبینن. دەرفەتێك بەدەست دەهێنن؛ بۆئەوەی کەسایەتیی خۆتان بەرز بکەنەوەو بگۆڕدرێن بە ڕێبەرێکی پایەدار.

١١- بۆ ئەو کەسانەی کە حەزیان بە کۆمەککردنی کەسانی ترە، ئێن ئێم دەرفەتێکە، تا ئەوکەسە کۆمەکی کەسانی تر بکاتو خەونەکانی خۆی بکاتە پراکتیك. ئەم بازرگانییە، ئومێد دەکاتە دیاری تاکەکان.

١٢- پێشکەوتنی ئەم بازرگانییە بەچێژە؛ چونکە بازرگانییەکە لەناو خەڵکدایە. لـەم بازرگانییەدا دەرفـەت دەڕەخسێت تا کەسانێکی زۆر لە هەمو شوێنەکانی دونیادا بناسیت.

### ئایا ئێن ئێم بە کەڵکی تۆ دێت؟

هەموان دەتوانن لە ئێن ئێم بەشدار بن، بەڵام بێگومان هەموو کەسێك تێیدا سەرکەوتوو نابێت. کەسانی سەرکەوتوو ئەوانەن کە تایبەتمەندییەکانو لێهاتوویی داهاتی بەهێزی ئێن ئێم درك دەکەنو ئامادەن بۆ سەرکەوتن، نرخەکەی بدەن. ئەم جۆرە نێتۆرکە سەرکەوتووانە دڵ بە دەریایەك ڕێگرو کێشە دەدەن. ئەم جۆرە کەسانە حەزێکی گەورەیان بۆ سەرکەوتنو پشتیوانی فراوان هەیە. ئەمانە کەسانێکن کە ڕێگە نادەن کەسانی تر خەونەکانیان بدزن.

ئەگەر بەدوای ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکی گەورە لە داهاتو شێوازی ژیانتەوەیت، ئێن ئێم بۆ تۆ گونجاوە. بەڵام پێویستە ئیرادەت هەبێت کە لە"ناوچەی هێمنی"ت بێیتە دەرەوەو دەست بدەیتە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە بۆتان نائاشنان؛ بۆئەوەی کە سەرکەوتوبن، پێویستە دەست بدەنە ئەنجامدانی کارگەلێك، کە ٩٠٪ی خەڵك حەزیان بە ئەنجامدانیان نییە. پێویستە کارە جیاوازەکان لەگەڵ ئەوانی تر ئەنجام بدەن.

### ئایا حەز بەم کارانەی خوارەوە دەکەیت؟

١- ئازادیو ئاسایشی ماڵی: هەبوونی ژیانێکی ڕوئیاییو زانینی ئەوەی کە داهاتت، تەنانەت دوای ئەوەشی کە دەست لە کار بکێشیتەوە بـەردەوام دەبێت. دوای ئەوە، تۆ نـەك لەبەر موحتاجی بە داهات، بەڵکو بە دەلیلی چێژوەرگرتن لە کارەکەتان چالاکی دەکەن.

٢- کاتی پێویستتان هەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە حەزیان پێ دەکەن. لەگەڵ ئیشو کارەکەتاندا "هاوسەرگیری" نەکەنو بتوانن کاتێکی زۆر لەگەڵ ئەزیزانتاندا بەسەر ببەن.

٣- بتوانن بـەدەوری دونیادا سەفەر بکەنو هەموو جێگایەك ببینن.

٤- بتوانن کەسانێك لە سەرانسەری دونیادا ببینن، پێشنیاری دۆستیەکی ڕاستانەیان پێ بدەن کە پێیان خۆشە بە چاوپۆشی لە نەژادو مەزهەب، چاودێریو کۆمەکتان بکەن.

٥- ژیانێکی شایستە بۆ هاوسەرو منداڵەکانتان فەراهەم بکەن.

٦- ئارامشی زهنیتان هەبێت.

ئەگەر دەستگەشتن بەو کارانەی کە باس کـران بەچێژە بـۆتـانو پێتان خۆشە بۆ ماوەیەکی کـورت، بەقووڵی هەوڵ بدەنو لە ئەزموونی پێشەنگە سەرکەوتووەکان پەیڕەوی بکەن، ئێن ئێم دەتوانێت خواستی ئێوە فەراهەم بکات. لە نێتۆرکی مارکێتینگدا"شکست" بوونو مانای نییە. ئەوە تەنها کەسەکانن کە لەوانەیە واز لەکارەکە بهێننو دەست لە هەوڵدان هەڵبگرن.



# پرسیارێکی سەرسوڕهێنەر

پەیام

لە دێرزەماندا پادشایەك هەبوو، كەسانی زیرەكو بیرتیژو لێهاتووی زۆر خۆش دەویست، بۆ ئەم مەبەستە بەردەوام پرسیاری لە وەزیرو كەسانی چواردەوری دەكرد، پرسیارگەلێك كە زیرەكی، لە كەسانی نازیرەك جیا دەكردەوە.

ڕۆژێكیان جەنابی پادشا، وەزیرە بەتەمەنەكەی بانگهێشت كرد بۆ كۆشكو پێی وت: پرسیارێكت لێ دەكەم، پێنج ڕۆژیش مۆڵەتت پێ دەدەم، ئەگەر لەو ماوەیەدا وەڵامەكەت زانی، ئەوا تۆ لە هەمان پلەوپایەی خۆتدا دەمێنیتەوە، خۆ ئەگەر لەو ماوەیەدا وەڵامەكەت نەزانی، ئەوا تۆ لە پۆستەكەت دوور دەخرێیتەوە، واتە: چیدی وەزیر نامێنیت.

پاشان پادشا پرسیارەكەی بەم شێوەیە ئاراستە كرد: ئەوە چییە دەڕواتو ڤاچی نییە، كاتێكیش ڕۆیشت كەس نازانێت بۆ كوێ دەڕوات؟

وەزیرە بەساڵاچووەكەی بە بیستنی ئەم پرسیارە سەختە نیگەران بوو؛ چونكە وەڵامەكەی نەدەزانی، بەخەمباری ملی ڕێگەی گرتو گەڕایەوە بۆ ماڵ.

هاوكات جەنابی وەزیر سێ كوڕەزای هەبوو، ڕۆژانە سەردانیان دەكردو هەواڵیان دەپرسی، لەو كاتەدا كوڕەزا گەورەكەی كە بۆ دیدەنی باپیری هاتبوو، بەپەرۆشەوە هەواڵی پرسی، بەڵام بینی باپیری زۆر سەرقاڵو خەمبارە، وتی: باپیرە شتێك ڕووی داوە؟

باپیری وتی: پادشا پرسیارێكی قورسی لێ كردووم، كە وەڵامەكەی نازانم، ئەگەر نەشتوانم لە ماوەی دیاریكراودا، وەڵام بدەمەوە؛ ئەوا لە پۆستەكەم دوورم دەخاتەوە.

كوڕەزاكەی وتی: پرسیارەكە چییە، كە تۆ ناتوانی وەڵامی بدەیتەوە؟

باپیری وتی: دەڕواتو ڤاچی نییە، كاتێكیش ڕۆیشت كەس نازانێت بۆ كوێ دەڕوات؟

كوڕەزاكەی وتی: خەمبار مەبە، خۆت نیگەران مەكە باپیرە گیان، هەر لە بنەڕەتدا ئەو پرسیارە وەڵامی نییە؛ چونكە هیچ شتێك بەبێ ڤاچ ناتوانێت بڕوات، تۆ ئەمڕۆ لە كار ماندوو بوویت، ئێستا كاتی پشووە، كەمێك بە ئارامی چاوەكانت لێك بنێو پشوو بدە.

پاش ئەم وتووێژە، كوڕەزای دووەمی هات بۆ لای بە مەبەستی دیدەنیو هەواڵپرسین، دووبارە ئەویش كاتێك چاوی بە باپیری كەوت، كە خەمبارو بێتاقەتە، لە هۆكارەكەی پرسی، باپیریشی چیرۆكەكەی بۆ گێڕایەوە.

كوڕەزای دووەمیشی بە هەمان شێوە وتی، هیچ شتێك بەبێ ڤاچ ناڕوات، ئەم پرسیارە بەهانەیە، پادشا دەیەوێت لە پۆستەكەت دوورت بخاتەوە، ئەمەی كردووە بە بیانوو.

بۆ ڕۆژی دواتر كوڕەزای سێیەمی سەردانی باپیری كرد، بە هەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو چیرۆكەكەی بۆ كوڕەزای سێهەمی گێڕایەوە.

ئەم كوڕەزایەی جیاواز لەوانی دیكە، بە باپیری وت: باپیرە سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارەكە، دواتر كوڕەزاكەی باپیری جێهێشتو بە شوێن وەڵامی پرسیارەكەدا ڕۆیشت بۆ كتێبخانەی شارو بە نێو پەڕاوەكانی كتێبەكاندا عەودالی دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارەكە بوو.

سێ ڕۆژ تەواو بوو، كوڕەزاكەی بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە بۆ لای باپیری، پێی وت: باپیرە گیان نیگەران مەبە، وەڵامەكەم دۆزییەوە، باپیری لە خۆشیدا شاگەشكە بوو، وتی: كوڕم پێم بڵێ، وەڵامەكە چییە؟

كوڕەزاكەی وتی: باپیرە (خۆر ڕووناكی دەبەخشێت، ڕووناكییەكەیشی دەڕوات بۆ هەر جێگەیەك بیەوێت، ڤاچیشی نییە، كاتێك ڕووناكییەكەی دەڕوات، كەس نازانێت بۆ كوێ دەڕوات).

هەمووان لە خۆشیدا بە یەك دەنگ هاواریان كردو وتیان: ڤاچی نییەو دەڕواتو كەس نازانێت بۆ كوێ دەڕوات.

دواتر باپیری بە كوڕەزاكەی وت: كوڕم چۆن توانیت ئەم وەڵامە دەست بخەیت؟

كوڕەزاكەی وتی: لەو سێ ڕۆژەدا سێ كتێبم خوێندەوە، لەو كتێبانەدا وەڵامی پرسیارەكەم دەست كەوت.

جەنابی وەزیر وتی: زانست ڕووناكییە، پەرتووكیش نهێنی بەختەوەرییە.

جەنابی وەزیر زۆر بە دڵخۆشییەوە ملی ڕێگەی بەرەو كۆشكی پاشا گرتەبەر، چووە لای پادشاو وەڵامی پرسیارەكەی دایەوە، بەمەش لە پۆستەكەی خۆیدا مایەوە، بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە هەرگیز لە كتێبو خوێندنەوە دانەبڕا، كتێب بووە هاوڕێو هاودەمی هەمیشەیی؛ چونكە كتێب بووە هۆكاری مانەوەی لە پۆستەكەیدا.



# مادده هۆشبەرەکان ٢\١

**١.هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی مادده هۆشبەرەکان:**

گومانی تێدا نییە، مادده هۆشبەرەکان یەکێکن لە مەترسیدارترین ئەو دەردانەی تووشی لاوانی جیهان هاتووە، کۆمەڵێك هۆکار هەیە بۆ بڵاوبوونەوەی:

بڵاوبوونەوەی بێکاریو کاتی بەتاڵ، فیلمە خراپەکان، لاوازیی هەستی ئاینی، کێشە خێزانییەکان، خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵاندا، فەرامۆشکردنی پەروەردەی منداڵ لەلایەن دایكو باوکەوە، هاوڕێی خراپ.

زۆر گەشتکردنی لاوانمان بۆ وڵاتانی دەرەوەو ئاسان دەستکەوتنی سێکسو مادده هۆشبەرەکان، دوور لەچاودێریی خێزان.

وڵاتانی داگیرکەر دەستێکی باڵایان هەیە لە هێنانو بڵاوکردنەوەیدا.

پەیوەندییەکی تۆکمە هەیە، لەنێوان نەخۆشیی ئایدزو ئالوودەبووندا، هەروەك خەمۆكیو نەخۆشییە دەروونییەکانی تریش، ڕێخۆشکەرن بۆ ئالوودەبوون.

بێگومان دووری لەخوداو ڕێبازی پاکی سەروەرمان، لە هەموو ئەم هۆکارانە زیاتر دەوریان هەیە، چ کەسێکی باوەڕدار توخنی ئەم کارانە دەکەوێت؟!

**٢.جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان:**

خراپترین جۆر ئەوانەن، کە ئالوودەبوونی دەروونی (لەڕووی دەروونییەوە کەسەکە پێویستی پێی دەبێتو بەبێ ئەوە ئارام نابێتەوە)و جەستەیی (لەشی کەسەکە ئازارو ناڕەحەتی تێدا دروست دەبێتو کارەکانی بەباشی ناکات؛ گەر ماددەکەی دەست نەکەوێت) دروست دەکەن، وەکو ئەفیونو جۆرەکانی(مۆرفینو هیرۆیین).

لەڕووی زانستی دەرمانسازییەوە، کاتێك دەوترێت: ماددەی هۆشبەر، ئەوا مەبەستیان ئەفیونو جۆرەکانێتی(مۆرفین، هیرۆیینو کۆدایین)، کاتێك دەوترێت: (خووگرتن بە دەرمان- Drug Dependence) واتە: کەسەکە ئالوودەی دەرمانێك بووەو بەبێ ئەو دەرمانە، هەراسان دەبێتو ئارامی لێ هەڵدەگیرێت. کاتێك دەوترێت: (خراپ بەکارهێنانی دەرمان- Drug Abuse) مەبەست لەو دەرمانانەیە، پاش بەکارهێنانیان، باری دەروونیو مێشکی کەسەکە تێك دەدەن.

ئەو ماددانەی سەردەکێشن بۆ ئالوودەبوون، دابەش دەبن بۆ ئەم جۆرانە:

**أ.کۆمەڵەی ئەفیونو لێوەرگیراوەکانی (Narcotics):**

**ئەفیون:**

یەکێکە لە مەترسیدارترین جۆرەکانی ماددەی هۆشبەر، ئەم ماددەیە لە بەرهەمی (ڕووەکی خاشخاش)ی پێنەگەیشتوو دەردەهێنرێت، پاش ڕووشاندنی شەربەتێکی سپی لینجی لێ دەردەچێت. بەکار دێت لەڕێی ڕاستەوخۆ قوتدانی، یان لەگەڵ چا، یان قاوە، یان لەگەڵ جگەرە دەکێشرێت، یا نێرگەلە.

بەکارهێنەرەکە سەرەتا هەست بە چالاکیو توانای خەیاڵکردنو قسەکردن دەکات، بەڵام ئەمە زۆر ناخایەنێت.. خێرا کەسەکە تووشی تێکچوونی دەروونیو ئالوودەبوون دەبێت. گەر کەسەکە خووی پێوە بگرێت، دەبێتە بەشێك لەژیانیو لەشی ناتوانێت کارەکانی خۆی بکاتو هەست بەئازارێکی زۆر دەکات، گەر ئەو بڕەی خووی پێوە گرتووە، ڕێ نەگرێت، لەئەنجامدا تەندرووستیی، ڕۆژبەڕۆژ خراپتر دەبێت، ماسولکەکانی دەپووکێتەوە، یادگەی لاوازدەبێت، ئارەزووی خواردنی کەم دەبێتەوەو کێشی دادەبەزێت.

**مۆرفین:**

بەکاربەرەکەی هەست بە لەشسووکیو چالاکییەکی زۆر دەکاتو وای لێ دەکات، زۆر ئارەزووی بەکارهێنانی بکات، پاشان پێویستی بەبڕی زۆرتر دەبێت، تاکو هەمان هەستی لا درووست بێت، بەڵام دواتر ئالوودەبوون وا لە کەسەکە دەکات، ئاو بەلووتیدا بێتە خوارەوە، دەمی وشك ببێت، چەندین جار بڕشێتەوە، لە هەموو لایەنێکەوە لاواز دەبێتو هەستو شعووری تێك دەچێت. گەر زیاتر بخوات؛ ئەوا ناوەندی هەناسەدان لە دەماخدا لاواز دەکاتو گوشاری خوێن دادەبەزێنێت، سەرەنجام ڕەنگە بشبێتە هۆی مردن.

**هیرۆیین:**

لە مۆرفیین وەردەگیرێتو دروووست دەکرێت. لە هەموو ماددەکانی تر گرانترە، ئالوودەبوونی زیاترەو مەترسیدارترە لەسەر تەندرووستیی کەسەکە، لەسەرەتادا هەست بە چالاکیو لەشسووکیو ئاسوودەیی دەکات، پاشان کەسەکە ئالوودە دەکاتو پێویستی بەزیادکردنی بڕەکەی دەبێت؛ تاکو بگاتەوە بەهەمان هەست، تا وای لێ دێت ئارامی لێدەبڕێتو هەموو ئاواتو هەوڵێکی، دەستکەوتنی بڕێکی زیاترە؛ تاکو لەو هەموو ئازارو ماسولکەڕەقبوونە ڕزگاری ببێت، کە لە ئەنجامی لێبڕانی هیرۆیینەوە، تووشیبووە. کەسی ئالوودە، تووشی لاوازییەکی زۆر دەبێت.. ئارەزووی خواردنی لاواز دەبێت، خەوی دەزڕێت، دڵەزمەی ترس ژیانی لێ تاڵ دەکات، لەوەی تووشی ئەو نەخۆشییە مەترسیدارانە ببێت، کە بە دەرزی بەکارهاتوو دەگوازرێتەوە. وەك: هەوکردنی جگەر، ئایدز،..هتد.و تووشی کێشەی لاوازیی سێکسیی دەبن.

**کۆدایین:**

ئەفییون بڕێکی کەم، کۆدایینی تێدایە، ئەم ماددەیە لە دەرمانەکانی چارەسەری کۆکەو ئازارشکێنەکاندا هەیە. ڕۆژبەڕۆژ هەوڵ دەدرێت ئەم ماددەیە لەو دەرمانانەدا کەم بکرێتەوە، نەوەك ببێتە هۆی ئالوودەبوون.

**ب. کۆمەڵەی وڕێنەپێکەرەکان(Hallucinogens):**

بەکارهێنانی دەبێتە هۆی پێچەوانەبوونەوەی باری دەروونی، کەسەکە وای لێ دێت ناتوانێت شتی نەگونجاو ڕەت بکاتەوە. بەکارهێنەکە سەرەتا ئێڵنج دەداتو هەست بەلاوازی دەکاتو سەری گێژ دەخوات، پاشان وڕێنە دەکات، گوایە دەنگی نامۆی بیستووە، هەستکردن بە کاتو دوورییەکانیش لەدەست دەدات. مەترسیدارترین جۆریان ئەوەیە پێی دەوترێت: (LSD)، ئالوودەبوون دەبێتە هۆی وڕێنەی بینینی شتی نامۆ، تێکچوونی هەستەوەرەکانو جاری وا هەیە ئەوەندە ناڕەحەت دەبێتو دەترسێت خۆی دەکوژێت!

ن: د. حسان شمسی پاشا
و: یەحیا محەممەد عەلی



# زیرەو سوودەکانی

زیـرە، یەکێکە لە ڕووەکـە گیاییەکانو لەجیهاندا لەڕووی بەکارهێنانەوە، بە دووەم جۆری بەهارات دادەنرێت، هیچ ماڵێك نییە زیرەی تێدا نەبێت، لە زۆر خواردندا بەکار دەهێنرێت؛ بەهۆی بۆنو تامە خۆشەکەیەوە، وێڕای بەکارهێنانی بەخواردن بێت، یان خواردنەوە بەهۆی تامو بۆنەکەیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لە بواری تەندرووستیدا زۆر بەسوودو گرنگە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی بەدەست کەمخەویو ئـازاری کۆڵۆنو کێشەکانی کۆئەندامی هەناسەوە دەناڵێنن، سوودەکانیشی ئەمانەن:

**یەکەم: نوێکردنەوەی وزە:**

زیرە، بە سەرچاوەیەکی زۆر دەوڵەمەندی ئاسن دادەنرێت، یارمەتیی بەدەستهێنانی ئاستێکی باشی وزەی پێویستی هەیە بۆ لـەشو یارمەتیی چالاکی سووڕی خوێن دەدات، دواتریش دەبێتە هۆی زۆربوونی ڕێژەی ئۆکسجین لە خوێنداو هەستکردن بەچالاکی، هەروەها بەهۆی چالاکی سووڕی خوێنەوە، ئۆکسجین دەگاتە هەموو بەشەکانی لەش، ئەمەش هەلی تووشبوون بە زەهایمەرو خڵەفان کەم دەکاتەوە.

**دووەم: کەم خەویو دڵەڕاوکێ:**

زیـرە بۆ ئـەو کەسانەی بـەدەست بێخەوییو دڵەڕاوکێو نـائـارامـیـەوە دەناڵێنن، زۆر بـاشو بـەسـووودە، بەباشترین ئارامکەرەوەی سرووشتی دادەنرێت.

**سێیەم: بەگری دژی شێرپەنجە:**

وتـەیـەك هەیە دەڵـێـت: "خـۆپـاراسـتـن لـە شێرپەنجە لە خوانەکەتەوە دەست پێ دەکات"، زۆر لە توێژینەوەکان باس لە گرنگیی زیرە دەکەن، خاسیەتی دژەگرێی شێرپەنجەی هەیە، واتە: بەرگری دەکات لە درووستبوونی گرێ شێرپەنجەییەکانو کاریگەریی بەهێزی هەیە لە پاراستن دژی شێرپەنجەی گەدەو کۆڵۆنو ئەوەش بەهۆی بوونی دژەئۆکسینەکان تێیدا.

**چوارەم: کۆئەندامی هەناسە:**

ئەگەر بەدەست هەوکردنی توورەکە هەواییەکان، یان نارێکی کۆئەندامی هەناسەوە دەناڵێنیت؛ ئەوا کووپێك لە زیرەی کوڵاو بخۆرەوە، کۆئەندامی هەناسە هێور دەکاتەوەو یارمەتی نەهێشتنی بەڵغەمو کۆکە دەدات. لەبەرئەوەی زیرە ڕێژەیەکی بەرزی لە ئاسنو ڤیتامین سی تێدایە، هەروەها دژە هەوکردنی تێدایەو بەرەنگاری ڤایرۆسەکانی تایبەت بە هەڵامەتو ئەنفلۆنزای دەکات.

**پێنجەم: کۆئەندامی هەرس:**

لەبەرئەوەی ئاوێتەی (پیمۆڵ)ی تێدایە، هانی گەدە دەدات؛ تا ئەو ترشە سرووشتییانە بەرهەم بهێنێت، کە یارمەتیی مژینی بەرزترین ڕێژەی پێکهاتە خۆراکییەکانی ناو خواردنەکە دەدەن، هەروەها بە چارەسەرێکی چالاك بۆ دڵ تێکهەڵاتنو سکچوونو بەدهەرسی دادەنرێت.

**شەشەم: بۆ شیردانی سرووشتی**

سـەرەڕای سوودی زیرە بۆ نوێکردنەوەو زیادکردنی وزە؛ بەهۆی ئاسنی پێویستەوە لە تۆوی زیرەدا، هەروەها بۆ دایکی شیردەر بەسوودە؛ لەبەرئەوەی هانی بەرهەمهێنانی شیری دایك دەدات. بۆیە ڕۆژانە پێویستە دایکی شیردەر بیخوات، سەرەڕای ئەوەی کالیسیۆمی پێویستی ڕۆژانە، دابین دەکات.

**حەوتەم: ژەهری لەش دەردەکات:**

زیرە، پلەی گەرمیی لەش بۆ باری سرووشتی بەرز دەکاتەوەو هانی کرداری میتاپۆلیزم دەدات، یارمەتیی باشکردنی فرمانەکانی جگەرو گورچیلە دەدات، ئـەوەش مانای ئەنجامێکی باشە بۆ ڕزگاربوون لە ژەهری لەش.

**هەشتەم: بۆ تەندرووستیی پێست:**

وەك لەخاڵی پێشوودا ئاماژەمان بە گرنگی دەرکردنی ژەهری لەش کرد بەهۆی زیرەوە، ئەمەش سوودێکی تری هەیە بۆ پێست، بەتایبەتی ئەوانەی دومەڵو لیری پێستو هەستیاری پێستیان هەیە، لەبەرئەوەی ڤیتامین ئی تێدایە، بەرگری لە دەرکەوتنی نیشانەکانی بەتەمەنی دەکاتو کاردژی میکرۆبە زیانبەخشەکانی تایبەت بە پێست دەکات.

سەرچاوە: ١. فستانی. ٢. كل يوم معلومة طبية.

دەڵێن: ئەگەر دەتەوێت لە ئاستێکی قووڵتردا کەسێك بناسیت؛ بڕوانە ئاوات، خواستەکان، خەونەکانیو هەرچیەکیش لە ئەو چرپانەی بە دڵیدا دێن کاتێك بەتەنیایە، ئەگەر ئەو خولیاو ئاواتانە لەبارەی کێشە بچووكو کەسییەکانەوە بێت؛ ئەوا خاوەنەکەشی کەسێکی بچووکە، بەڵام ئەگەر لە مەڕ سوودی گشتیو گۆڕانکاری گەورەوە بێت؛ ئەوا خاوەنەکەی مەزنە. ڕۆڵەکانم، ئەم پێوەرە زۆر وردە؛ چونکە ئەوەی لەدەست خەڵکدایە بە چاکەو خراپەوە، هەمیشە بەندە بە بارودۆخو پێداویستییە فەراهەمەکانەوە، لە کاتێکدا هەرچی ئەوەی خەونی پێوە دەبیننو بە ئاواتیەوەن، پەیوەستە بە ڕوحو کرۆکی خودی خۆیانەوە، هیچ کۆتو بەندێکی لێ نەبەستراوە، بۆیە ئەوپەڕی گوزارشت لە خۆیان دەکات.

ڕاستییەکەی خۆشەویستانم، ئەو موسڵمانەی کە پابەندە بە ڕاستی ئایینەکەیەوە، هەردەم بۆ بەجێهێنانی کاری خێر، لە دڵەڕاوکێدایە لە نێوان ئەو خێرەی کە بەئەنجامی دەگەیەنێتو ئەوەی کە ئاواتەخوازە جێبەجێی بکات، بۆیە هەمیشە دڵێکی وابەستەی هەیە، ویژدانیشی لەوپەڕی ئاسوودەییدایە.

گەلێك دەقمان هەیە لەبارەی سووربوون لەسەر نیازی خێرو ئاواتخواستنی بەجێهێنانی، کە موسڵمان هان دەدات بۆ پیادەکردنی، وەك پەیامبەرمان (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (کارە چاکەکان، خراپەکان دەسڕێتەوە)، پاشان فەرمویانە، ئەوەی بەنیازە کارێکی خێر بکات، بەڵام بۆی بەجێ نەهێنرا، خوای گەورە پاداشتی کارێکی تەواوی بۆ دەنووسێت، خۆ ئەگەر کارەکەی ئەنجام دا، خوای گەورە بە دە هێند، تا حەوت سەد پاداشتی دەداتەوە.

بێگومان ڕۆڵەکانم، مەبەست لەوشەی (نیاز) ئەو نیازە نییە کە بە خەیاڵ دا دێتو پاش تۆزێك لەبیری دەکەین، هەروەك چۆن ختووورە کاتیەکانمان لەبیر دەچێتەوە. بەڵکو مەبەست لێی ئەو نیازەیە کە سووربوونو نەخشەکێشانی لەگەڵدایەو کارەکەی لەگەڵدا ئەنجام دەدرێت. یەکێك لەو وتانەی کە هانی ئەنجامدانی کاری خێرو نیازی پاك دەدات، وتەی ئەبو دەردائە (خوای لێ ڕازی بێت): «هەر کەسێك کە شەو بەو نیازەوە بخەوێت کە هەڵبسێتەوەو شەونوێژ بکات، بەڵام خەبەری نەبوویەوە هەتا بەیانی، خێری ئەو شەونوێژەی بۆ دەنووسرێت». هەروەها سەعیدی کوڕی موسەییەب دەفەرموێت: «هەر کەسێك نیازی ئەنجامدانی نوێژ، یان ڕۆژو، یاخود حەج، یان عەمرەی هەبێت، بەڵام ڕێگرییەك هەبوو لە بەجێهێنانیدا، خوای گەورە بەپێی نیازەکەی پاداشتی دەداتــەوە». زەیدی کوڕی ئەسلەم دەگێڕێتەوە: پیاوێك بەنێو زاناکاندا دەگەڕاو دەیپرسی: « کێ ڕێنموویيم دەکات بۆ کارێك کە هەمیشە بـەردەوام بم لەسەر بەجێهێنانی بۆ خودای گەورە؛ چونکە من حەز ناکەم کاتژمێرێکم لێ بڕواتو کارێکم بۆ خودا تێدا نەکردبێت، لەوەڵامی ئەوەدا فەرموویان: بێگومان وەڵامی خۆت دەست دەکەوێت، هەتا لەتوانات دایە، کاری خێر ئەنجام بدە، ئەگەر ساردبوونەوەیەك ڕووی تێ کردیت، یان لە بەجێهێنانی کاری خێردا وەستایت، ئەوسا بەنیازی ئەنجامدانی کاری خێر بە؛ چونکە نیازی چاکەکردن، وەك جێبەجێکەری چاکەکە وەهایە.»

هەروەها دەگێڕنەوە: عبداللە ی کوڕی ئیمام ئەحمەد، بە ئەحمەدی باوکی گوتووە: «باوکە، ئامۆژگاریم بکە، باوکیشی فەرمووی: «کوڕم هەمیشە بە نیازی کاری خێر بە؛ چونکە هەتا ئەو نیازەت هەبێت، خۆشت بێبەڵا دەبیت».

### ئایا ئەم باسە چی دەگەیەنێت بۆ کوڕوکچەکانم ؟

ئەم باسە ئەمواتایانەی هەیە:

١. چاکەکارانی ئەم نەتەوەیە، پێیان خۆشە چاکە بەرامبەر خەڵکی بکەنو موسڵمانان لە خێروخۆشیدا ببینن.

٢. گەورەترین بەڵگە لەسەر بوونی خواستی چاکەکردنو ویستی ئەنجامدانی، بریتییە لە سەرقاڵبوون بە ئەنجامدانی کاری خێرەوە، بەڕادەیەك ئەگەر تەگەرەو کۆسپیش ڕێگای لە ئەنجامدانی گرت، پەنا دەباتە بەر ئاواتەکانیو بە ئاراستەی خێردا دەیانبات، پاشان چاوەڕێ دەکات هەتا دەرفەتێکی بۆ بڕەخسێت، تا بەکردار بەرجەستەی بکاتو بیخاتە گەڕ.

٣. سوودمەندی سەرەکی لە کارە خێرەکاندا، ئەو کەسانە نین کە چاکەکەیان بەرامبەر دەکرێت، بەڵکو ئەو کەسانەن کە کارە خێرەکە دەکەن؛ چونکە پاداشتی خوای گەورە، هیچ هاوتایەکی نییە.

٤. نیازەکانتان بکەن بەپێوەر، بۆ ناسینی ناوەڕۆکی کەسێتیو ئەو بەهایانەی بڕواتان پێیە، هەروەها بیکەن بە پێوەرێك بۆ دیاریکردنی ڕادەی سووربوونتان لە سوودگەیاندن بە کەسوکارو وڵاتو خەڵکی دەوروبەرتان.

٥. با هەریەك لە ئێوە، ڕۆژانە کارێکی چاکەی بچووك ئەنجام بدات، بۆ نموونە خێرکردن بە پارە (٢٥٠ دینار)، هەواڵپرسینی هاوڕێیەکت، ئامۆژگاریکردنی کەسێکی کەمتەرخەم، فێرکردنی نەزانێك، یارمەتیدانی هاوڕێیەك لە وانەیەکداو دەسپێشخەریکردن لە سڵاوکردندا...

٦. هەمیشە بـەراورد بکەن لە نێوان ئەو کارەی کە بە ئەنجامی دەگەیەننو ئەوەی ئاواتەخوازن بەدیی بهێنن، با ئەوەی کە ئاواتەخوازن بەدیی بهێنن، گەورەترو باڵاتر بێتو هەمیشە هەوڵ بدەن بەدیی بهێنن.

٧. نیازی چاکەکردن بکەن بە بەربەستێك لە نێوان خۆتانو کەوتنە نێو تاوانەوە، هەروەها با ببێت بە بەربەستێك بۆ ڕێگرتن لە گرفتاربوون بە خۆپەرستیەوە.

٨. لەگەڵ کەسوکارو هـاوڕێ نزیکەکانتاندا باسی خواستو ئاواتەکانتان بکەن، داوای یارمەتییان لێ بکەنو ڕاوێژیان پێ بکەن لە بارەی چۆنیەتی گەیشتن بە هیواو ئاواتەکانتان.



# بێسنوور چاکەکارن

و: ئاسیا صەلاح

٥٠ مۆم بۆ ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەتان

مۆمی ٤١ بۆ کوڕو کچە لاوەکانم



ئەو شتانەی باوکم، لە ژیاندا پێی نەگوتووم!

و: چیمەن لەتیف

# خۆکوژی

ئایینێکی ئاسمانی، یان بیرێکی فەلسەفی لە گەردووندا نابینیت کە خۆکوشتن بە چارەسەر، یان ڕێگایەك بۆ ڕاستکردنەوەی کارێك بزانێت.

خۆکوشتن بێباوەڕییە بەرانبەر بە خودا، بە فیرۆدانی ژیانە، بانگەشەیە بۆ سەرنەکەوتنو لاوازیی کەسی خۆکوژە.

بەڵام ئەو خۆکوشتنەی لێردا دەمەوێت لە بارەیەوە بدوێم، کوشتنی جەستەو فەوتانی ڕۆح نییە، بەڵکو مەبەستم کوشتنی ناخە (خۆکوژیی گیانە)، دەستگرتنە بەسەر باوەڕو هیممەتدا، بەرەنگاریو گیانی کارکردنە کە پەروەردگاری باڵادەست پێی بەخشیوین.

ئێمە لە ڕۆژگارێکدا دەژین، پڕە لە ژاوەژاوی نانخۆری جێگر، ڕازین بە خراپترین گوزەران، بەگوێرەی ڕۆژو کاژێرەکانی تەمەنی هەر یەکێکیان، بەسەر سەریانەوە ژمێرەرێکی نەبینراو دانراوە، کاتێك کاتی دەستنیشانکراوی نزیك دەبێتەوە؛ "مەبەست وادەی مەرگە" بەئارامی چاو دادەخات، ئەم دنیا فانییە بەجێ دەهێڵێت، بێئەوەی لەم ژیانەدا کاریگەرییەکی هەبوو بێت.

چەند کلۆڵ دەژین، بێئەوەی بتوانین لەم ژیانەدا، تۆوێکی چاکە، یان ڕاستییەك بڕوێنین، یاخود داری زانستێك لێ بدەین؛ بۆئەوەی دوای خۆمان لەم ژیانەدا، بەکەڵکی یەکێك بێت، تا لەو ڕۆژەدا کە هەموو شت دەڕواتو تەنها کردەوە گەورەکان دەمێننەوە، خۆمانی پێدا هەڵبواسین، بەهیوای ئەوەی لە نارەحەتییەکانی دواڕۆژ ڕزگارمان بکات.

نووسەری تەنساز (جۆرج بەرنارد شۆ)، بەم وتەیەی هەندێك ئیحراج دەکات، کە دەڵێت: (تا ئەوەندەی هیوام هەبێت، کەواتە: پاساوێکم هەیە بۆ مانەوەم لە ژیاندا، ڕازیبوون واتە: مردن). قەناعەت واتە: ڕازیبوون نییە، ئەوەی لێرەدا مەبەستە، وەستانو تەواشانەکردنە بۆ پێشەوە، واتە: کۆتاییهێنانە بە ئاواتەکانت لە ژیاندا، بۆ تێڕوانینەکانت هێڵێکی کۆتایی بکێشیت.

لای خۆیەوە ئەدیبی گەورە (مصطفى صادق الرافعي)، بە وتەیەك ڕوو لە کەسە سستو لاوازەکان دەکاتو دەڵێت: (هەرکەس شتێك نەخاتە سەر لەم دنیایەدا، ئەوا خۆی بارە بەسەر دنیاوە).

یان دەبێت مۆرێکی پرشنگدار لەسەر تەوێڵی ئەم ژیانە بدەیت، یاخود خۆتو ئاواتەکانت دەبن بە غەمو پەژارەو سەربار دەبیت بەسەر ئەم ژیانەوە.

یان ئەوەتا مێژوویەکی گەورەی پرشنگدار دەنووسیتەوە، یاخود ئەو ڕۆژەی جەستەت لە گۆڕ دەنرێتو دەشارێتەوەو پەڕەکانی ژیانت دەپێچرێتەوە ئیدی کەس ناوت ناهێنێت.

**دڵۆپەی تیشك:**

لە پوختەی ژیانی کەسانێك لەوکاتەوە وە ئاگا هاتوون نەخەوتوون، لەو ساتەوەی ڕێگایان گرتۆتەبەر نەوێستاون، تێگەیشتنیان، هەڵکشانو دەرکەوتن بووە، لە هەر پلەو پایەیەکدا هەڵکشابن بۆ جێگاو پایەیەکی تر... هەستیان بەکەموکووڕی خۆیان کردووە، داوای لێخۆشبوونیان کردووە. (ئیبن جەوزی).



# ئایا تۆ سەرکردەیت، یان شوێنکەوتوو؟

١- بەرزترین پلە چییە، کە لە پیشەکەتدا بەدەستت هێناوە؟

أ- بەڕێوەبەر. ب- سەرپەرشتیار. ج- هیچیان.

٢- ئایا هیچ کات لە لیژنەیەکدا کارت کردووە؟

أ- بەڵێ، سەرۆکی لیژنە بووم. ب- ئەندامی لیژنە بووم. ج- نەخێر.

٣- ئایا لەو بڕوایەدایت، بتوانیت ببیتە کەسێکی سیاسیی سەرکەوتوو؟

أ- بەڵێ. ب- لەوانەیە. ج- نەخێر.

٤- تا چەند ئاواتت گەیشتنە بەم ئامانجانە؟

أ- دەتەوێت بگەیتە بەرزترین پلە لە پیشەکەتدا.

ب- دەتەوێت بگەیتە ئاستێك کە باری داراییت باش بکات.

ج- دەتەوێت ژیانێکی خێزانی ئارامو جێگیرت هەبێت.

٥- ئایا وای بەباش دەزانیت، سەرەڕای هەموو شتە نوێیەکان تۆ پارێزگاری لە نەریتە تایبەتەکانی خۆت بکەیتو بەردەوام بیت لەسەریان؟

أ- پارێزگاری لە نەریتەکانت دەکەیت.

ب- کەمێك لە هەردووکیان.

ج- لەگەڵ تازەگەریو نوێخوازییەکەدا دەڕۆم.

٦- بۆچوونت چییە سەبارەت بە گەیشتنی فەرمانەکان؟

أ- تۆ زۆر بەختەوەر نیت.

ب- هەندێجار پێویستن، ئەگەر گونجاو بێت هیچ مەرجێکم نییە.

ج- بەشێوەیەکی گشتی گوێیان پێ نادەم.

٧- چ شێوازێکی کارکردنت پێ باشە؟

أ- کاری ڕێکخراوەییو تۆکمە. ب- شوێنی هەڵبژاردنە تایبەتەکانی خۆت دەکەویت. ج- حەز دەکەیت ببیتە ڕێکخەری کارەکان.

٨- کاتێك یەکێك لە هاوکارەکانت کە ساڵانێکە پێکەوە کار دەکەن، پلەی بەرز دەبێتەوە بۆ سەروو پلەکەی تۆوە، پەرچەکردارت چۆن دەبێت؟

أ- بەتەواوی نیگەران دەبیت؛ چونکە دڵنیایت لەوەی ناتوانیت ڕووبەڕووی بووەستیتەوە.

ب- سەرسام دەبیت، کە بۆچی تۆ پلەت بەرز نەکراوەتەوە، بەڵام بیریش لەوە دەکەیتەوە کە لە ئایندەدا لەگەڵیدا کار بکەیت، ئەو پۆستەش کاریگەری لەسەر هاوڕێیەتیتان نابێت.

ج- لەگەڵ ئەوەشدا کە هەست بە نیگەرانی دەکەیت، هیچ هەستێکی خراپت لا دروووست نابێت، هاوکات پیرۆزباییشی لێ دەکەیت.

٩- ئایا لەو بڕوایەدا بوویت کە ڕۆژێك ببیتە بەڕێوەبەر، کاتێك دەست بەکار دەکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- بەڵێ هیوام وایە کە زیاتر لەو پلەیە بەدەست بهێنم، کە لە خەیاڵمدایە. ج- زۆر بیری لێ ناکەمەوە.

١٠- ئایا پێش هاتووە جووڵەیەك لە کۆمەڵگەکەت درووست بکەیت، بۆ پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ درووستکردنی یەکەی نیشتەجێبوون؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر، بەڵام لەوانەیە ڕۆژێك بێت ڕۆڵێکی لەو شێوەیە ببینم. ج- نەخێر، خۆشحاڵم کە ئەم کارە واز لێ بهێنم بۆ کەسانی دیکە.

١١- ئایا هیچ ڕۆژێك بووە کە تۆ سەرۆکایەتیی فەرمانگەی کارکردنت، یاخود خوێندنگەکەت بکەیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر، لەگەڵ ئەوەشدا کە من شایستەی ئەو

پۆستە بووم. ج- نەخێر.

١٢- ئایا خۆت وا دەبینیت، کە حەزت لە یاسایە؟

أ- بەڵێ. ب- لەوانەیە، هەندێجار. ج- بەشێوەیەکی تایبەتی نا.

١٣- ئایا دەکرێت کارە هەمیشەییەکەت بگۆڕیت کە بڕوات وایە تێیدا پلەت بەرز نابێتەوە، بە کارێکی دیکە بە هەمان مووچە، بەڵام ئەگەری پلە بەرز بوونەوەت هەیە؟

أ- بەڵێ. ب- دڵنیانیت کە دەگونجێت ئەو کارە بکەیت، تا کاتی خۆی نەیەت. ج- نەخێر.

١٤- ئایا ڕێزی کەسانی بەرپرس دەگریت؟

أ- نەخێر. ب- هەندێجار. ج- بەڵێ هەمیشە.

١٥- ئایا لەناخی دڵتەوە لەو بڕوایەدایت کە هەمووان یەکسانن؟

أ- نەخێر. ب- بەڵێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لەو یەکسانانە زیاترن لەوانی دیکە. ج- بەڵێ من بڕوام بە کۆمەڵگەیەکی بێ جیاوازی هەیە.

١٦- ئایا بڕوات بە یەکگرتن هەیە، بۆ بازرگانییەکی بەهێز؟

أ- نەخێر. ب- تاڕادەیەك. ج- بەڵێ.

١٧- ئایا هیچ کات خۆپیشاندانت ڕێك خستووە، بۆ دژایەتیی فەرمانێك کە ناگونجێت لەگەڵ تۆدا، یان بڕوات پێی نییە.

أ- بەڵێ. ب- نەخێر، بەڵام بەشداریم لەم جۆرە خۆپیشاندانەدا کردووە. ج- نەخێر.

١٨- کام لەم سیاسییانە لای تۆ بەرێزن؟

أ- مارگرێت تاتشر. ب- بیل کلینتون. ج- لیش فالیسا.

١٩- ئایا لەو بڕوایەدایت کە لە سەدەی بیستو یەکدا سەرکردایەتییەکی بەهێز پێویستە؟

أ- بەڵێ، هەمیشە پێویستمان بە سەرکردایەتییەکی بەهێز هەیە. ب- سەرکردایەتیی بەهێز پێویستە؛ بۆئەوەی دەوڵەتەکەمان نەبێتە دەوڵەتێکی دۆڕاو.

ج- نەخێر، سەرکردایەتیی توند پەسەندکراو نییە، کەواتە: هاوکاریکردن گرنگترە لە هێز.

٢٠- ڕاوێژ بە هیچ کەس دەکەیت لە دەرەوەی خێزانەکەی خۆت؟

أ- بەڵێ زۆرجار. ب- هەندێجار. ج- هەرگیز، یان زۆر بە دەگمەن.

٢١- ئایا هیچ کات بیرت کردۆتەوە، کە لە شوێنێکی بەهێز، یان گرنگدا بیت؟

أ- بەڵێ. ب- نەخێر. ج- بە هیچ شێوەیەك بیرم لێ نەکردۆتەوە.

٢٢- تۆو هاوڕێکانت لە چێشتخانەیەکن، خزمەتگوزاری لە نێو چێشتخانەکە زۆر خراپە، چی دەکەیت ئەگەر دوای کاتژمێرێك چاوەڕوانیو چەندجار ئاگادار کردنەوە بەدەمتانەوە نەهاتن؟

أ- پێشنیار دەکەیت کە هەمووان چێشتخانەکە جێ بهێڵنو دەنگی ناڕەزایی بەرز بکەنەوە. ب- دادەنیشیو سکاڵا دەکەیتو پرسیار لە هاوڕێکانت دەکەیت کە دەبێت چی بکەن؟ ج- چاوەڕێ دەکەیت کەسێکی دیکە پێشنیارێك پێشکەش بکات، هەموان پێکەوە ڕێك بکەونو بەزۆرینە کارێك بکەن.

٢٣- ئایا هیچ جۆرە ڕێکخستنێکت ڕێك خستووە؟

أ- بەڵێ لە هەندێك بۆنەدا. ب- بەڵێ، تەنها یەك جار. ج- هەرگیز.

٢٤- تا چەند حەساسییەتت بە ڕەخنەی توند هەیە؟

أ- جیاوازی نییە لای من. ب- هەوڵ دەدەم کە ڕەخنەکان بێزارم نەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێجار ئازاربەخشن.

ج- زۆر هەستیارم بەرامبەر ڕەخنە توندەکان.

٢٥- بە بڕوای تۆ گرنگترین سیفاتی سەرکردە چییە؟

أ- بەزەیی. ب- هاندەر. ج- ئەزموون.

ئەنجام: دوو خاڵ بۆ وەڵامی (أ)، یەك خاڵ بۆ وەڵامی (ب)، سفر بۆ وەڵامی (ج) دابنێ.

یەکەم: ئەگەر کۆی خاڵەکانت لەنێوان (٣٥ - ٥٠) خاڵ بوو: مانای وایە تۆ خاوەنی سیفاتگەلێکی زۆر باشی، بۆئەوەی ببیتە سەرکردەیەکی لێهاتوو، ئەوە دەگەیەنێت، کە تۆ خاوەنی چەند تایبەتمەندییەکی زۆر باشی کە لە سەرکردەی گەورەدا هەیە، ئەمەش ئەو شتەیە کە تۆ هەوڵی بۆ دەدەیتو دەتەوێت پێی بگەیت. لە کاتێکدا هێشتا لەو پیشەی هەڵتبژاردووە، نەگەیشتوویت بەو ئاستەی کە دەتەوێت.. مایەی خۆشحاڵیتە کە تۆ کارەکانت ڕێك دەخەیت ئەگەر پێویست بوو، حەز دەکەیت لە سەرکردایەتیکردندا لە پێشەوەو لە بەرچاوی هەمواندا بیت، هەستیش بە ساردبونەوە دەکەیت، ئەگەر کەسێك جێگەی تۆی گرتەوە.

هەمیشە بیر بکەرەوە، کە پێویستە مرۆڤ فێربێتو سوود وەربگرێت لەوەی کەسانی دی دەیکەن، ڕاوێژکردن بەشێکە لە کارە گرنگەکانی سەرکردە؛ چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانی زۆر شوێنت بکەونو هاوکارت بن.

لە تایبەتمەندییەکانت: هیواو ئاوات، چالاكو گورجوگۆڵ، خاوەنی لێبڕاویو نەرمونیانی.

دووەم: ئەگەر کۆی خاڵەکانت گەیشتە ١٦-٣٤:

مانای تۆ خاوەنی چەند سیفاتێکی سەرکردەییت، هەمیشە حەز دەکەیت پێشەنگ بیت، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی بۆ دەدەیت، بەڵام بە لای تۆوە شتێکی گرنگ نییە لە ژیانتدا، خۆشحاڵ دەبیت ئەگەر کەسێك لە شوێنی تۆدا بێت، بە مەرجێك ڕاوێژت پێ بکاتو لە بڕیارو شێوەو کارکردنیدا بگونجێت لەگەڵتدا. تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیت: ئارامگر، خاوەن ڕەوشت، هاوکارو یارمەتیدەرە، پەیوەندییەکانت شیرزن.

سێیەم: ئەگەر کۆی خاڵەکانت لە ١٦ کەمتر بوو:

مانای وایە کە تۆ هیچ هیواو ئاواتێکت نییە؛ بۆئەوەی ببیتە سەرکردە، بەڵام بە پێچەوانەوە خۆشحاڵ دەبیت کە کەسانی دیکە ڕچە دەشکێننو دەستپێشخەر دەبن، لە ڕاستیدا تۆ ناگەیتە پلەی سەرکردایەتیی گرنگ؛ بە هۆی ئەوەی کە خۆت هیواو ئاواتت نییە، ببیتە سەرکردە، بەڵام کۆششو هەوڵەکانت هەندێك لە دەستکەوتەکانت بۆ بەدی دەهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ متمانەت بە تواناکانی خۆت نییە، هەوڵی خۆدەرخستنیش نادەیت، وەکو کەسانی دی، تۆ زۆر ئاسایی ژیان دەگوزەرێنیت، لە تایبەتمەندییەکانت، بە قەناعەت، چالاك، خۆپەرست نیت، هاوکات هیواو ئاواتی گەورەشت نییە.

# وەڵامی بەجێ

هێنری فۆرد، جارێکیان بە تەکسی دەچێت بۆ شوێنێکو کرێیەکی کەم بە شۆفێرەکە دەدات، شـــوفێری تەکسییەکە کە فۆرد دەناســێت، بە دەم پرتەو بۆڵەوە دەڵێت: بەڕێز فۆرد، کچەکەتان پارەی باشتر دەدات!

فــۆرد پێی دەڵێت: چونکە ئەو باوکێکی ملیاردێری هەیە، خۆزگە منیش باوکێکی وام هەبووایە.

پێشــەوا عومەر بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیشــت، لەســەر ڕێگە کۆمەڵێک منداڵ ســەرگەرمی یاریکردن بوون، کاتێک پێشەوایان بینی، هەموان ڕایان کرد، تەنها یەک منداڵیان لە جێگەی خۆیوەســتاو ڕای نەکرد، پێشــەوا لێی نزیک بوویەوەو وتی: کوڕم چۆن بوو؛ تۆش وەک هاوڕێکانت ڕات نەکرد؟

منداڵەکە وتی: تاوانم نەکردووە تا لە دادپەروەرییەکەت بترسمو سزام بدەیت، هاوکات تۆ فەرمانڕەوایەکی ســتەمکار نیت، تا لە ستەمەکەت بترســم، ڕێگەکەش فراوانە، جێگەی منیشو تۆش دەبێتەوە..

کابرایەکــی خۆوەردەر، پێی خۆش نەبوو، کە هەیاســی خاس لەنــاو زاناو فەقیهەکاندا ناوبانگــی بە زانــاو بلیمەت دەرکردووە، لەبەرئەوە ڕۆژێک ڕۆیشــت بۆ لای هەیاسو لێی پرسی: بۆچی لەوەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا پەلە دەکەیت؟

هەیاسی خاس پێی گوت: پەنجەکانی دەست چەند دانەن؟

کابرا وتی: پێنج.

هەیاس وتی: بۆچی لەوەڵامدانەوەدا پەلەت کرد؟

کابرا وتی: چونکە پێویستم بە بیرکردنەوە نەبوو.

هەیاس وتی: منیش لەوەڵامی پرسیارەکاندا، پێویستم بە بیرکردنەوە نییە!

هەرگیز تەسلیم مەبە هەرگیز، لە هیچ شتێکدا گەورە بێت، یا بچووک، تەنها تەسلیم بـە بنەما ئـەخـلاقـیو ڕێـگـاو بـڕیـارە ڕاسـتـەکـان ببە.

چەرچڵ سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا

هاوڕێکانمان کەمترن لەوەی لە خەیاڵماندان، بەڵام زۆرترن لەوەی کە دەیانناسین.

هۆگۆڤۆن- نووسەر

هـێـز لـە چـاوەڕوانـیـدا دەسـت دەکـەوێـت.

جوزیە مارتی - نووسەر

مرۆڤی ئاسایی، دەیەوێت بێ بەرامبەر، هەموو شتێکی دەست بکەوێت، ئەو هەرگیز نایەوێت کار بکات، بەڵکو نایەوێت بیریش بکاتەوە.

جیسی لیڤەرمور - شارەزای بواری دارایی

هەوڵ دەدەم بە دڵم ڕابگەیەنم، کە ئارەزووی شتێك نەکات کە ناتوانێ ببێ بە خاوەنی.

ئەلیس‌ولکەر - ژنە نوسەر

ژیان‌وا ڕێکخراوە، کە ئەگەر بتەوێ چێژ لە خۆشییەکانی وەربگریت؛ دەبێت ئازارەکانیشی پەسەند بکەیت، هەرگیز یەکێکیان بێئەوەی دی نابێت.

سوامی فەیلەسوف



# گۆرانی بلێ بۆ ژیان



نارین جووتیار

# 10 زیرەکترین کەسایەتییەکانی جیهان

## 5 ئیڤانجیلۆس کاتسیۆلیس

پزیشکی نەخۆشییە دەروونییەکانە، بڕوانامەی لە بوارەکانی فەلسەفەو تەکنەلۆژیای توێژینەوەو دەرمانسازیی دەروونی بەدەست هێناوە، هاوکات وێنەکێشێکی بلیمەتو مەلەوانێکی پیشەگەر بووە، ئاستی زیرەکی دەگاتە ١٩٨ بە پێی پێوانەی زیرەکیی جیهانی.

* **کورتەیەك لە ژیانی:** ئیڤانجیلۆس بە ڕەگەز یۆنانییە لە ١٩ی ینایری ١٩٧٦ لە سالۆنیك لە یۆنان لەدایك بووە، خوێندنی پزیشکی لە زانکۆی ئەرستۆ لە ساڵی ٢٠٠٠ تەواو کردووە، پاشان لە سەنتەری چاودێریی تەندرووستی لە کورفو لە ساڵانی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠١ دەستبەکار بووە. لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٣و ٢٠٠٤ چووەتە پاڵ سوپای نیشتمانی. لە ٢٠٠٥ تا ٢٠٠٧ تایبەتمەندی وەرگرت لە بواری پزیشکیی دەروونی، لە ٢٠١١ لە نەخۆشخانەی گشتیی باباجۆرجیۆی، تایبەتمەندی لە زانستی دەمار وەرگرتووە، دواتر لە ٢٠١٢ بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری فەلسەفە وەرگرت. کەسێکی زۆر چالاك بووە، سەرەڕای بوونی تێڕوانینی جیاواز لەوەی کەسێکی دوورەپەرێزو نامۆ بووە، لە قوتابخانە دەربڕینی لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بووە، گرنگی بە هەموو لایەنێکی ژیان داوەو لەوانەکانی بیرکاریو فیزیادا بلیمەت بووەو لە زۆربەی پێشبڕکێیەکانی قوتابخانەدا بەژداری کردووە، پلەی نایابی بەدەست هێناوە، بەتایبەتی لە قۆناغی ناوەندی، هەر بۆیە لە کۆلێژ هەستی بە هیچ ماندووبوونێك نەکردووە.

**کاری گشتی:** لە کاتی وەرگرتنی پسپۆڕیدا، لە زانستی دەماردا توێژینەوەی لەسەر هەوکردنی مێشك ئەنجام داو نووسەری کتێبو وتارو سیناریۆی تەلەفزیۆنیو دامەزرێنەری چەندین ڕێکخراوو کۆمەڵە بووە، چەندین وتاری لەبارەی بیری کۆمەڵگەو فەلسەفەو هەواڵگریو دڵەڕاوکێو خەمۆکیو شێوازی نوێی ژیان نووسیوە.

* کاتسیۆلیس باسی ئەزموونی ژیانی دەکاتو دەڵێت: لە ساڵی ٢٠٠٠ بەشداریم لە تاقیکردنەوەی زیرەکی کرد، کاتی خزمەتی نیشتمانی لە کۆرفو لە تۆڕەکانی ئینتەرنێت لاپەڕەی تاقیکردنەوەی زیرەکیم تێبینی کرد، ئەوە یەکەم پەیوەندیکردنم بوو، ویستم لەوە دڵنیا بم، ئاخۆ ئەو تاقیکردنەوەیە دانپێنراوە! چونکە ناونیشانی زیرەکترین پیاو، هەموو شتێك نییە ڕاستە بەهۆیەوە دەناسرێیت لە هەموو جیهان، بەڵام "لە نیازمدا نەبوو پلەیەکی وا بەرز وەربگرم، تەنها بۆئەوەی ڕواڵەتی ڕاستەقینە ببینم بۆ بەدرۆخستنەوەی ڕاگەیاندنەکان "بۆم دەرکەوت زۆربەی کۆمەڵەو ڕێکخراوە زانستییەکان پشتگیری دەکەنو بووم بە ئەندام لەو کۆمەڵانە.

پێشبینی کارکردنم دەکرد لە دەزگایەکی گەورەی وەکو ناسا: گومانی تێدا نییە، تۆ لە ئاستێکی وا بەرزدا بیت، چەندان پێشنیارت ڕووبەڕوو دەکرێن لە گۆڕەپانی سیاسی، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتی بێت، یان ئەکادیمی، ئیفانجیلۆس دەڵێت: خەونێکی هەمیشەییم بوو لە دەزگای ناسا کار بکەم؛ تا تواناکانم بەرەو پێش ببەم. کاتێك لە لایەن کۆمەڵگاوە ویستراو دەبیت بڕوابەخۆبوونت زیاتر دەبێت، هەمیشە هەوڵم دەدا ببمە ئەوەی

که دەمەوێت بەردەوام دەمخوێندو دەمخوێندەوە، پێویستە مرۆڤ خۆی خۆی دروووست بکات، هەروەها لێیان پرسیوە، کارکردنت لە بواری فەلسەفەدا، پەیوەندی هەیە بە ئاستی زیرەکیت؟ سەبارەت بە تۆ هۆکارێك نییە بۆ دەرخستنی توانا عەقڵییەکانت لە کۆمەڵگا، یان ئەوە تەنیا بۆچوونێکی کەسییە؟ لەوەڵامدا دەڵێت: مامەڵەکردن لەگەڵ فەلسەفەدا، دەکرێت پێناسەو دەستکەوت بێت لە ڕێگەی چالاکیو بەشداریکردن لە خوێندنی باڵا، وەك لایەنێکی دیار بەڵام خۆی لە خۆیدا هۆکارە بۆ ژیان، شۆڕشە بەرخودانە. فەلسەفە پرسیار درووست دەکاتو هانت دەدات؛ تا بەدوای وەڵامدا بگەڕێیت، دوورت دەخاتەوە لە ڕاستی چوارچێوەیەکی پتەو درووست دەکات؛ بۆ زیاتر تێگەیشتن لە خودو لە جیهانی دەوروبەر. من زۆر پرسیار دەکەم، پرسیار لە هەموو شتێك دەکەم، پرسیارکردن زۆر ئاسانە، هەتا ئەگەر وەڵامەکەشی زۆر قورس بێت!

**هەستی ئیفانجیلۆس دوای ناوداریيەکەی:** هەر مرۆڤەو شێوازی تایبەت بە خۆی هەیە بۆ ژیان ئەو ژیانێکی مامناوەندی هەبووەو گوێی بەوە نەداوە، کە خەڵکی چی دەڵێنو چۆن سەبارەت بە ئەو بیر دەکەنەوە هەرچەندە زۆرجار کارەکانی جێی تێڕامانی دەوروبەر بووە، بەڵام ئەو هەرگیز نەوەستاوەو ئامانجێکی دیاریکراوی هەبووە هەوڵی بەدیهێنانی داوە، پەیوەندییەکانی ڕاستگۆیانە بوونە هەرگیز هەنگاوەکانی بۆ دواوە نەگەڕاوەتەوە بەرەوپێشچووە. دەڵێت: بوونی ناوم لە کەسایەتییە دیارەکان شەرەفێکی زۆر گەورەیە، بەڵام کاریگەری نابێتو بڕوای من ناگۆڕێت بەوەی کە ئەوە گرنگ بێت بۆ من..! تەنها هەوڵ دەدەم، ئەوە بکەم کە خۆم دەمەوێت، نەك ئەوەی من جیاواز بم لە نەتەوەکەم، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو دۆخەدا ئاسان نییە، لە کاتێکدا پێویستە کەسایەتییەکان، بە سادەیی وەری بگرنو بیکەنە هۆی زیاتر بەرەوپێشبردنو باشترکردنی ژیانیان.

سەبارەت بەو منداڵانەی پلەی بەرزیان هەیە لە زیرەکی دەڵێ: زۆربەی منداڵان دوچاری گرفت دەبنەوە لە قوتابخانە، بەهرەکانیان سیس دەبنو توانا لەدەست دەدەن، بەداخەوە هیچ گرنگی پێدانێکی تایبەت نییە؛ تا بەهرەو تواناکانیان لەدەست نەدەن، یان پەرەی پێ بدەن. بەڵکو بەهرەکانیان کەم دەکات، هەر لادانێکیش هەبێت، لە قۆناغی ناوەندیدا دەبێت، بۆیە پێویستە گرنگیان پێ بدرێتو لەڕووی ماددیو مەعنەوییەوە، هاوکاری بکرێن؛ تا ببنە کەسانێکی سوودبەخش بۆ کۆمەڵگا.

***کاردانەوەی کۆمەڵگاو دەوروبەر:** تێڕوانینەکانی خەڵکی سەبارەت بە کاتسیۆلیس جیاواز بوون؛ بەهۆی ئەوەی پزیشکی دەروونی بوو، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خەڵکیو نەخۆشەکانی هەبوو، ئاساییە کە هەندێجار ساردی بکەوێتە نێوان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانو دوچاری خەمۆکی ببێت، بەڵام کاتسیۆلیس دەڵێت: پاش ڕاگەیاندنی ئەو نازناوە، هەڵوێستی نەتەوەو کەسە نزیکەکانم لەبارەی منەوە گۆڕانکارییان بەسەردا نەهات، بەڵام ئەو خەڵکانەی نەیاندەناسیم، زۆرجار زێدەڕۆییان دەکرد لە داواکارییەکان، بۆیە ناچار دەبووم بەوریاییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم، هەمیشە هەوڵم داوە، تواناکانم پیشان بدەم بۆ هەر ڕایەك، یان هەر هەڵوێستێكو ئەو بەربەستانە بشکێنم، یان بە لایەنی کەم ئاسانیان بکەم کە دێنە پێشم؛ تا ئەوە بهێنمە دی کە داوام لێ دەکەن، پلە بە پلە ڕووبەرووی دەبمەوە بەرگری دەکەم لە هەموو ئاڕاستەکانەوە لە کۆمەڵگایەکی جۆراوجۆر کە خەڵکەکەی ڕوئیای جیاوازیان هەیە، بە شێوەیەکی پەسەند بەرگری دەکەم. هەروەها دەڵێ:."ئێمە ناتوانین کاری زۆر بکەین، بەڵام دەتوانین بە بڕینی سنوورێك، مێژوویەك بۆ خۆمان تۆمار بکەین".

ئایا ئەوان ئاسوودەن بەو ناوداریيە؟ بێگومان نەخێر؛ چونکە ئەوە کۆمەڵگا دای ناوە، شتێك نییە بە ناوی بێکەموکورتی، هەموان خاڵی بەهێزو لاوازیان هەیە، پێویست ناکات داوەری بکرێ تەنها بە ناووناوبانگ، ئەو وتەیە ئیفاجیلۆس هەمیشە بەوانەی دەڵێت، کە پەیوەندی پێوە دەکەن، ئەوەیە دەڵێت: ((هەمیشە ئەوە بکە کە دەتەوێت، گوێ بەوە مەدە، خەڵکی چۆن دەبیننو چۆن بیر دەکەنەوە)). ئەگەر تۆ لەو بڕوایەدابیت کە هەموان پشتیوانیت دەکەن؛ ئەوا تۆ لە هەڵەدایت؛ لەبەرئەوەی ئەوانەی نازناوو دەستکەوتی مەزن بە دەست دەهێنن، هەمیشە ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبنەوە، چۆن توانیت دەوڵەمەند بیت، یاخود ناوبانگ پەیدا بکەیت، بەبێئەوەی هیچ شتێك ئەنجام بدەیت؟

هەست دەکەم کە زۆربەی گیروگرفتەکانی ژیان، ئەوکاتە پەرە دەسێنن، کە ڕەنگێکی تایبەت بە ژیانمان دەبەخشین ئەو کارە وا دەکات جیاوازبین لە کەسانی تر، بەڵام ئەوەی گرنگە کۆتاییەکەیە. ئەو بارودۆخەی هەمانە بە کاتو شوێنەوە هاندەرە بۆ تێگەیشتنمان لە بوونمان، بارودۆخی سرووشتیو مرۆیی نزمترین ئاستی پەیپێبردنمانە بۆ ژیان. پێویستە بوونی خۆمان بسەلمێنینو ئامانجی مەزنمان هەبێت؛ بۆ بەدیهێنانی تێبکۆشین، مامۆستاو پێشەنگ بۆخۆمان هەڵبژێرینو هۆکارەکانی خۆشترکردنی شێوازی ژیان بگرینەبەر؛ تا ببینە ڕێنیشاندەر، ژیان سادەیە، ئەوە ئێمەین ئاڵۆزی دەکەین لەسەر خۆمان بەو داواکارییە زۆرانەمان، دوو بنەما هەیە بۆ مرۆڤ:

یەکەم: بۆچوونی خۆت هەبێت سەبارەت بەخۆت.

دووەم: کاتێ هەڵسەنگاندن بۆخۆت دەکەیت، بگەیتە هەمان ناونیشان کە بۆ خۆتت بە شیاو زانیوە. لە هەردوو بارودۆخەکەدا لەگەڵ بنەماکەش ناگونجێ کە بەرگری لەخۆت بکەیت، بەڵکو لەگەڵ "بەرگری" گرنگ ئەوەیە دەرفەت بڕەخسێنی تا لەگەڵ ئەو خەڵکە نایابانەدا، چاوپێکەوتن بکەیتو بەهرەو تواناکانت بڕەخسێنیت، ئامادەییت هەبێت لە کۆمەڵگەو هەموو چالاکییەك لە جیهان، وەك کەسێکی شارەزاو بەتوانا.

کەواتە: زیرەکیو گەشەپێدانی تایبەت یەکێکە لە بنچینە گرنگەکان بۆ کەسێك کە بتوانێت بە شێوەیەکی درووست ئیستغلالی بکات، بەهۆیەوە دەتوانێت شێوازو جۆری ژیانی بگۆڕێت کاروبارەکانی ئاسانو ڕاییی بکاتو دەربڕینو هەڵوێستەکانی ڕوونترو داهێنان کارانەتر دەبن.

# متمانەبەخۆبوون

زاهیر زانا

متمانەبەخۆبوون، هەستی مرۆڤە بە نرخی خۆیو تواناو بەهرەکانیو بزوێنەرێکی بەهێزە بۆ خستنەگەڕی مرۆڤ بەرەو سەرکەوتنو دوورخستنەوەی لەدڵەڕاوکێو نیگەرانیو شەرمو خۆبەکەم سەیرکردنو خنکاندنو پووکاندنەوەی تواناکانی، کاتێك ئێمە هەستی متمانەبوونمان بەخۆمان هەبێت؛ کێشەو گرفتەکان بەبچووك دەبینینو خۆمان بە شایستەی ئەوە دەبینین، کە لەژیاندا تێبکۆشینو داهاتوویەکی جوانتر بۆ خۆمان فەراهەم بکەین. بەپێچەوانەشەوە، ئەو مرۆڤانەی بڕوابەخۆبوونیان لەدەست داوە زیندانێکیان بۆ بەهرەکانی خۆیان درووست کردووەو درەختی ژینی خۆیان، بێبەرو گوڵو گەڵا دەکەنو دەرفەتەکانی ژیانو سەرکەوتن لەدەست خۆیان دەدەن؛ چونکە پێیان وایە ئەوان بێتوانان، وەك بەچکە هەڵۆیەکیان لێ دێت، کە بەهێلکەیی کرابێتە ژێر مریشكو کاتێکیش لە هێلکە هاتۆتە دەرەوە، بڕوای وا بووە، کە ئەو مریشکەو تەنها بەئەندازەی جوچکەکانی هاوڕێی باڵی جوڵاندووەو خۆی لەفڕینو گەشتی ئاسمان بێبەش کردووە. ئازیزان، متمانەبەخۆبوون زۆر گرنگو پێویستە بۆ ژیان، کاتێك کەسێك بڕوابەخۆبوون لەدەست دەدات، وەك ئەوە وایە بەزیندوێتی مردبێت، لەبەرئەوەی بێ بڕیارو کردارو گەشە دەبێتو لەدۆخێکدا دەوەستێت، هۆکاریش زۆرن بۆ ئەم دەردە کە ئەمەی خوارەوە هەندێکن لەوانە:

١- پەروەردەی خێزان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت، بۆیە زۆر گرنگە نەوەکانمان بەهەستی متمانەبەخۆبوونەوە، پەروەردە بکەینو ڕێزیان لێبگرینو هەر لە منداڵییەوە بواریان پێ بدەین؛ تا بەشداربن لە درووستکردنی بڕیارو لە هەموو کێشەیەکی بچووکدا هاوکاریان نەکەین؛ تاوەکو پشت بەخۆیان ببەستنو دەستەوسان نەبن.

٢- شکست لە کارێکی پێشووتردا، دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ متمانەی بەخۆی لاواز بێت، جا ئەم شکستە لە هەر بوارێکی ژیاندابێت، وەك: خوێندن، خێزان، بازرگانیو هتد. بەڵام دەبێت بەبیر خۆمانی بهێنینەوە، کە شکست خۆی ئەزموونێکەو هەنگاوێکە بەرەو سەرکەوتن، وەك کورد دەڵێت: (سوار تا نەگلێت؛ نابێت بەسوار)، مرۆڤیش تاشکست نەهێنیت؛ ناگات بە سەرکەوتن، لەم کاتانەدا پێویستە سەرکەوتنەکانی خۆشمان بهێنینە پێش چاومانو بزانین کە چەندین سەختی هەیە، بڕیومانەو خاڵە بەهێزەکانی خۆمان بهێنینەوە بیر؛ تاوەکو لایەنی دەروونیمان بەرز ببێتەوەدو متمانەبەخۆبوونمان لەدەست نەدەین.

٣- ترسو دڵەڕاوکێو زۆر لێکدانەوە لەدەرەنجامی ئەوەی کە ئەگەر بڕیار بدات کارێك بکات، یاخود شتێك بڵێت تووشی هەڵە ببێت، بەڵام ئەو کەسەی هیچ ناکات قەد هەڵە ناکات، بەڵام لەبیرمان بێت، گەورەترین هەڵە هیچنەکردنە!.

٤- هاوڕێ کاریگەری لەسەر تەواوی کەسایەتیی مرۆڤ بەجێ دەهێڵێت، هاوڕێی ئیجابیو متمانەبەخۆبوو، مرۆڤ بەرەو لای متمانەبەخۆبوون دەبات، وەك دەڵێن: (هاوڕێی باش، هەروەك عەترفرۆشە.. گەر لێشی نەکڕی، هەر بۆنی خۆشە). هاوڕێی ڕووخاویش، مرۆڤ دەرووخێنێتو وای لێ دەکات، بڕوای بەخۆیو تواناکانی نەبێتو ببێتە کەسێکی لاوازو تەنها بۆ شتەکان بڕوانێو بینەربێت، نەك ببێتە کاراکتەرێکی چالاكو بەهرەو وزەو تواناکانی بخاتە گەڕ.

٥- ڕوخسارو جلو بەگ، مرۆڤ گەر بایەخ بەخۆی نەدات، لایەنی دەروونی لاواز دەبێتو متمانەی بەخۆی کەم دەبێت، لەبەرئەوە باش وایە خۆمان بڕازێنینەوەو پۆشاکی جوانو ڕازاوە لەبەر بکەین، کە هەستمان بەرانبەر بەخۆمان باش ببێت، ئەمە واتای ئەوە نییە، کە جلو بەرگەکەمان گران بەها بێت؛ چونکە ئەوەی ناو دەفرەکە گرنگە، نەك دەفرەکە، با بڕوابەخۆبوونمان، وەك ئیمامی شافیعی بێ، کە دەفەرموێت: (عليه ثياب لو تباع جميعها بفلس لكان الفلس أكثرا...وفيهن نفس ولو تقاس ببعضها نفوس الورى، لكان أجلا وأكبرا). واتە: (جلو بەرگێکم لەبەردایە، گەر هەمووی بفرۆشی بە فلسێك، هێشتا فلسەکە زۆرترە.. بەڵام نەفسێکی تێدایە، ئەگەر بەشێکی بەهەموو نەفسەکان بپێویت، هێشتا ئەم زیاترە). ئەمە متمانەبەخۆبوونو نرخی خۆزانینە، نەك لوتبەرزیو خۆبەگەورەبینین، دەبێت وشیار بینو خۆبەکەمگرتنمان، نەبێتە خۆبەکەمزانین؛ لەبەرئەوەی کاتێك نرخی خۆمان نەزانین؛ ناتوانین نرخو بەها، بە شتەکانی تریش ببەخشین.

ئەزیزانم، هەر یەکێك لە ئێمە، زۆر بەنرخو ناوازەینو هاوتامان نییە، بۆیە کراوینەتە جێنشینی پەروەردگار لە زەویدا. ئەمەش دەمانگەیەنێت بەوەی کە توانای پێویستو بەهرەی گەورەمان پێ بەخشراوە؛ تاوەکو زەوی، ئاوەدان بکەینەوە.






# نموونەیەکی دیکە لە دادوەریی هەیاسی خاس

هەیاس بە قازییەکی بیرتیژو زیرەکییەکی ناوازەو خێرایی لە وەڵامدانەوەو چارەسەری کێشە دادوەرییەکانداو دادپەروەری ناوبانگی شاری تەنی بوو، بە جۆرێك هەر کات کێشەیەکی دەهاتە بەردەم، بێئەوەی خولەکێك بیری لێ بکاتەوە، بە جوانترین شێوەو زۆر دادوەرانە وەڵامی گونجاوی دەدایەوە، بە شێوەیەك هیچ کام لەو دوو کەسەی کێشەکەیان هەبووە، نەیاندەتوانی ڕەخنە لە وەڵامەکانی هەیاس بگرن.

ئیبن عەساکیر لە مێژووەکەیدا دەڵێت: هەیاسی کوڕی موعاویە جارێکیان هات بۆ مزگەوت، دوو ڕکات نوێژی کردو پاشان بە پاسەوانەکەی گوت: با بە ڕیز سکاڵاکاران بێنە ژوورەوە، ئیبن عەساکیر دەڵێت: هەیاس لە جێگەکەی خۆی هەڵنەسا؛ تا حەفتا کێشەی دادوەری چارەسەر کرد، خێرایی لە چارەسەری کێشە دادوەرییەکان، مانای ئەوە نەبوو، کە کەمتەرخەم بێت لە ڕاییکردنی کێشەکاندا، هەروەها خێراییەکەی مەبەست ئەوە نەبووە، کە بە کەیفی خۆی وەڵام بداتەوە، یاخود بە گومان وەڵام بداتەوە، نەخێر، بەڵکو هێزی زیرەکیو بیرتیژیی وای کردبوو، کە بەخێرایی کێشەکان، چارەسەر بکات، هەرگیز دادوەری نەکردووە بە یەقین نەبێت، (لە گۆشەی وەڵامی بەجێ لاپەڕە ٢٦ هۆکاری وەڵامدانەوە خێراکانی هەیاس بخوێنەرەوە).

نموونەیەك لەو کێشە دادوەرییانەی کە هەیاس بەخێرایی وەڵامی داوەتەوە: ئیبراهیمی کوڕی مەرزوق دەڵێت: جارێکیان دوو پیاو هاتن بۆ لای هەیاسی خاس، کێشەیان بوو لەسەر دوو عەمامە، کە یەك لە عەمامەکان سوور بوو، ئەوی دیکەیان سەوز، سکاڵاکار وتی: جەنابی قازی من بە مەبەستی مەلەکردن چوومە نێو حەوزی مزگەوتەوە، عەمامەکەم لەسەر لێواری حەوزەکە دانا، دوای من ئەم پیاوەش هاتو عەمامەکەی لە تەنیشت عەمامەکەی منەوە داناو پاشان هاتە ناو حەوزەکەوە، بەڵام لە پێش منەوە لە حەوزەکە چووە دەرەوەو عەمامەکەی منی هەڵگرتو ڕۆیشت، منیش هاتمە دەرەوەو شوێنی کەوتمو پێم گوت کە عەمامەکەی منت هەڵگرتووە، لە بری عەمامەکەی خۆت، بەڵام ئەو نکوڵی لێ دەکاتو دەڵێت نەخێر عەمامەکەی خۆمە.

هەیاسی خاس فەرمانی کردو وتی: شانەیەکم بۆ بهێنن، بە سکاڵاکاری گوت، قژت بەو شانەیە دابهێنە، بینی بە شانەکەوە وردە خوری سوور هاتە دەرەوە، بە سکاڵا لێکراویشی گوت: تۆش سەرت دابهێنە، بە قژی ئەویشەوە وردە خوری سەوز هاتە دەرەوە، پاشان عەمامە سوورەکەی دایەوە بەو سکاڵاکارەی کە وردە خوری سوور بە شانەکەوە هاتبووە دەرەوەو عەمامە سەوزەکەشی دایەوە بە سکاڵالێکراو کە وردە خوری سەوز بە شانەکەوە هاتبووە دەرەوە.

بەو شێوەیەو بێئەوەی هیچیان زیندان بکات، یان سزا بدرێن کێشەکەی بۆ چارەسەرکردنو کەسیشیان نەیانتوانی ڕەخنە لە دادوەرییەکەی بگرن؛ چونکە هەر یەکیان بوونەوە بە خاوەنی عەمامەی خۆیان..

بە ویستی خودا لە ژمارەکانی داهاتوودا، باس لەو کێشانەی دیکە دەکەین، کە هەیاسی خاس بە ئاسانترین شێوەو بە زووترین کات چارەسەری کردوون، بەو هیوایەی لە زیرەکیو لێهاتوویی ئەم دادوەرە بیرتیژو دادپەروەرە، پەند وەربگرین.

# موتەنەبی

## ٣٠٣ - ٣٥٤



بەرزان ئەبوبەکر

ئەبو تەییب ئەحمەدی کوڕی حسێنی کوڕی حەسەنی کوڕی عبدالصمد الجعفی الکندی، موتەنەبی بە سەرداری شاعیرانی سەدەی چواری کۆچی دادەنرێت، هەندێکی دیکە بە گەورەترین شاعیری عەرەبو بە دیارترین شاعیری جیهان ئەژماری دەکەن، کەهلان کە ڕەچەڵەکیەتی، دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێکی عەرەبی لە وڵاتی یەمەن، کە خاوەنی زمانێکی پاراوو ڕەوانبێژییەکی باش بوون.

**ڕەچەڵەکی موتەنەبی:**

موتەنەبی لە ساڵی ٣٠٣ کۆچی لە گەڕەکی کیندە، لە شاری کوفە هاتۆتە دونیاوە، ئافرەتێکی عەلەوی شیری پێ داوە، خێزانەکەی دەستکورتو نەداربوون، پێدەچێت ئەو دەستکورتیو نەدارییەی خێزانەکەی، بووبێت بە پاڵنەرێکی بەهێز، بۆ بەدەستهێنانی ستایشو سەرکەوتنو ناوبانگی.

**پەروەردەبوونی:**

موتەنەبی لە شاری کوفە گەورە بووە، سەرەتای ژیانی، دەستی کردووە بە خوێندن لە حوجرەی منداڵە خانەدانەکان، زمانی عەرەبی لە ڕووی زمانو ئیعرابو شیعرەوە خوێندووە، پاشان چووە بۆ ناوچە بیابانشینەکان، بۆئەوەی زمانی پاراو بێت بە تێکەڵاویکردنی لەگەڵ هۆزە دەشتەکییەکان، موتەنەبی توانی لە کۆڕو کۆمەڵەکانی ئەو ناوچەیە، فێری زمانپاراویو ڕەوانبێژییەکی باش ببێت. بەڵام ماوەی مانەوەی لە نێو دەشتەکییەکاندا زۆری نەخایاند، لە ساڵی ٣٢٠ کۆچیدا، بڕیاری دا بچێت بۆ بەغداد، ئیدی لە بەغدادەوە درێژەی بە گەشتکردنی داو چووە بۆ دیاری ڕەبیعە، پاشان چووە بۆ شاری موسڵو لەوێشەوە «نصیبین، راس عین»، پاشان ڕۆیشتووەتە بانی شام، لە شام بە هۆی بانگەشەکانییەوە فەرمانڕەوای شاری حمص فەرمانی دەستگیرکردنی دەرکردووەو زیندانی کردووە، لە زینداندا یەکەم کاری بریتی بووە لە نووسینی پارچە شیعرێك بۆ ئەوەی سۆزو بەزەیی فەرمانڕەوا، بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، ساڵی ٣٢١ لە زیندان ئازاد کراوەو نازناوی متنبی پێ بەخشراوە.

موتەنەبی پیاوێکی چاوتێرو ڕەوشتجوان بووە، بەڵام خاڵی نەبووە لە وشکیو سیفەتی زبری پیاوەتی، بە کەسێکی ئازاو بوێرو دەستپێشخەر ناسراوە، دوور بووە لە دەروونزمیو بێهێزیو لاوازی.

سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی لە ناوچەیەکی دەشتەکیدا، کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر دروستبوونی ئەم سیفەتە باشانە هەبووە، لە وتە بەناوبانگەکانی سەبارەت بە خودی خۆی، کە سەبارەت بە بوێریو خۆخستنە ناومەترسیی خۆیەوە دەدوێت:

ردي حياض الردى يا نفس واتركي
حياض خوف الردى للشام والنعم

واتە: ئەی گیان بگەڕێرەوە بۆ جەرگەی جەنگ، مەیدانی ترس بۆ مەڕو ئاژەڵ بەجێ بهێڵە!

هەروەها ئەم دێڕەش باسی بەناوبانگی خۆی دەکات:

الخيلوالليلوالبيداء تعرفني    والسيفوالرمحوالقرطاسوالقلم

ئەسپ، شەو، بیابان دەمناسن، شمشێرو نێزەو کاغەزو قەڵەمیش.

ئەم دێڕە شیعرەی سەرەوە، تا ئێستاش لەو دێڕانەیە کە لەسەر زارەو لە بەناوبانگترین دێڕی شیعری موتەنەبییە، بگرە بەناوبانگترین دێڕە شیعری عەرەبییە.

موتەنەبی بە هەژاریو نەداری ژیانی گوزەراندووە، شیعری وەکو پیشەیەك بۆ پەیداکردنی نانو بژێوی ژیانی وتووە، ئەم دێڕە شیعرە سوربوونی بۆ داواکردنی ڕۆزی دەخاتەڕوو:

ضاق صدري وطال في طلب الرز    ق قيامي وقل عنه قعودي

واتە: دڵم توندەو هێندە هەستام بەدوای ڕۆزیدا بەکەمی دانیشتووم.

دیارترین سیفەتی موتەنەبی کە لە ئاکارو ڕەوشتیدا ڕەنگی داوەتەوە، هیواو ئاواتەکانی بوو، هیواو ئاواتێك کە سنووری نەبوو، هیوای ئەوەندە بەرز بوو، کە نەیدەزانی چی دەوێت لە ڕۆژگار، جارێك ئاواتەخواز بوو ببێت بە سەرکردەو فەرمانڕەوای وڵاتو ببێت بە خاوەنی دەسەڵات، جارێکیش هیواکانی ئەوەندە ئاڵۆزو نادیار بوو، کە نەیدەتوانی دیاری بکات، لەبەرئەوە موتەنەبی بەدەست هیوا زۆرەکانی خۆیەوە ماندوو بووە.

هەروەها لە ڕەوشتەکانی موتەنەبی: لەئاست ژیانی سەردەمی خۆی، خۆی بە بەرزتر داناوە، هەرگیز ملی نەداوە بۆ هەواو ئارەزووە کاتییەکان، کەسێکی ڕەوشتجوانو ئاکاربەرز بووە، خاڵی بووە لە گوناهو تاوانە گەورەکان.

ئەوەندە هەستی بە گەورەیی خۆی کردووە، کە گەیشتۆتە ئاستی نەخۆشی، واتە: هیچ کات خۆی بە کەم نەزانیوە، بەشێوەیەك کە ئەم سیفەتەی بووەتە جێگەی مشتومڕی توێژەران، هەندێك پێیان وابووە ئەو جۆرە خۆبەگەورەزانینە شێتییە، هەندێکیش بە گرێی نێرگسی ناویان بردووە، هەندێکی دیکەش دەڵێن ئەو هەستە لە ئەنجامی سەرکەوتنەکانیو زیرەکیی سرووشتیی خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە.

خاڵێکی دیکە لە ئاکارەکانی موتەنەبی ئەوەبووە کە بەتەنگەوەهاتنو دڵڕاگرتنی نەزانیوە، یان بڵێین ماستاوکردنی نەزانیوە، ئەم سیفەتەشی بووەتە هۆی ئازارو ناڕەحەتی بۆی؛ چونکە وای کردووە دوژمنی زۆر بێتو دۆستی کەم، ئەو هەرگیز حەزی بە موجامەلەو تەمسیل نەکردووە، بەسەرهاتەکانیشی لەم بارەیەوە دەنگی داوەتەوە، بەتایبەت لە هەڵوێستی لەگەڵ «ئەبی فیراس، ئیبن خالەوەیهی، مەهلەبی وصاحب بن عەبباد»و زۆری دیکەش.. ئەوان زۆر ئازاریان داوەو دوچاری دەردەسەرییان

کـــردووە؛ چونکـــە فەرمانەکانـــی ئەوانـــی جێبەجـــێ نەکردووەو گوێڕایەڵیـــان نەبووە، خۆ ئەگەر گوێڕایەڵیان بووایەو شـــیعری بە باڵایاندا هەڵبدایە، ئەوا لە ئەمانو خۆشگوزەرانیدا دەژیا.

لە دیارترین دێڕە شـــیعرەکانی، کە باس لە دڵسۆزی سیفەتی بەرزو کەسایەتیو خۆشەویستیی خۆی، بۆ ئەو کەسانە دەکات کە خۆشی دەوێن:

خلقت الوفا لو رجعت الى الصبا لفارقتشيبىموجع‌القلب‌باكيا

ئەم وەفادارییە لە ڕاســـتی هەســـتەکانی لە قووڵایـــی ناخییەوە هەڵقوڵاوەو ســـەرچاوەی گرتووە، هەروەها داشـــۆرینی هەمیشە میرو کاربەدەستەکان کە پێشتر پێیدا هەڵگوتبوون، لەبەر نەمانی دڵسۆزیو خۆشەویستی نەبووە، بەڵکو بەهۆی بەخۆداچوونەوەوە بووە.

بەشێك لە ڕەفتارە نەرێنییەکانیشی بریتی بووە لەوەی کە کەسێکی میزاجی بووە، لە هەندێك شـــوێندا هەڵوێســـتی دژ بە یەکی هەبووە، لەو کەســـانە نەبووە کە ڕقی خۆیان بخۆنەوەو لە خەڵکی ببوورن، لە ڕەشبینیش بەدوور نەبووەو گومانی خراپی بە خەڵکی بردووە:

غيري باكثر هذا الناس ينخدع إن حاربوا جبنوا أو حدثوا شـــجعوا

هەروەها موتەنەبی بە کەسێکی ڕژدو بەخیل تۆمەتبار کراوە، لەگەڵ ئەوەشـــدا ڕژد نەبووە، بەڵکو خاوەنی فەلسەفەیەکە کە لە دەردەسەریی ڕاســـتەقینەوە هەڵقوڵیوە، لەڕێی ئەو فەلسەفەیەی خۆیەوە، هەستی بە نرخو بەهای ماڵو ســـامان کردووە، ماڵیش نەك وەك ئامانجێك، بەڵکو بۆ یارمەتیدانی بەڕێوەبردنی ژیانی ئاسایی خۆی:

وما رغبتى فى عسجد استفيده ولكنها فى مفخر استجده

لـــە ڕووی ڕۆشـــنبیریو مێژوویيـــەوە.. دەبینیـــن دیوانەکەی موتەنەبـــی ڕەنگدانـــەوەی وێنـــای بارودۆخـــی مێژوویو کێشـــمە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەی خۆیەتی، هەروەها ئایینو فەلسەفەش شوێنەواری بەسەر شیعرەکانییەوە ڕوونو ئاشکرایە، ئەمەش یەکێك بووە لە دەرهاویشـــتەکانی ســـەردەمی خۆی، کە پڕبووە لە ڕێبازە هـــزریو فەلســـەفیو ئایینییەکان. هەروەهـــا موتەنەبی، کاریگەری قورئانی پیرۆزو دەربڕینـــە بەهێزو گەورەکانی قورئانی زۆر پێوە دیار بووە، ئەمەش لە زۆربەی بەیتە شیعرەکانیدا دەرکەوتووە.

## گەشتەکانی موتەنەبی:

دوای ئەوەی لە ســـتەمو فێڵی دوژمنەکانی گەیشتو لە زیندانی حیمس ئازاد کـــرا، پەیوەندیی کرد بە تەنوخییەکانەوە لە لازقیە، ماوەیـــەك لای ئەوان مایەوە، پەیوەندیی پتـــەوی لەگەڵ نەوەکانی ئیسحاقی تەنوخی بەست، لە شیعرەکانیدا بە جوانترین شێوە باسی لێوە کردوون، کە بە یەکێك لە شـــیعرە زۆر جوانەکانی موتەنەبی ئەژمار دەکرێت. پاشـــان ڕۆیشـــتووە بۆ کوفە، ماوەیەکیش لە کوفە ســـەرقاڵی زانست بووە، لەگەڵ ئەوەشـــدا تا ستایشی جوانی خەڵکی بکات، یان بە شیعرەکانی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی تۆمار بکات.

پاشـــان لە ســـاڵی ٣٢٦ کۆچی، کوفەی جێ هێشتووەو بۆ جاری دووەم چووە بۆ وڵاتی شـــام، ســـەردانی چەند شـــارێکی کردووە لە وڵاتی شـــام، تا ســـاڵی ٣٢٨ کۆچی لە ڕکێفو ئامێزی بەدری کوڕی عەممار ئۆقرەی گرت، بەدر باشو خۆشمامەڵە بووە، موتەنەبی لە کۆشـــکەکەی ئەودا، هەســـتی بە ئۆقرەییەك کردووەو زۆر دڵخۆش بـــووەو هیواو ئاواتەکانـــی نوێ بوونەتەوە، بـــەڵام ئەم جێگەیەش بۆ هەمیشـــە درێـــژەی نەکێشـــا، دوژمنـــانو نەیارانـــی هەوڵیاندا نێوانی موتەنەبیو فەرمانڕەوا تێك بدەن؛ چونکە شـــاعیرانی ئەو کاتـــە بەخیلیان پێ بردووەو ویســـتوویانە فێڵی لـــێ بکەن، ئیدی فەرمانـــڕەوا وردەوردە موتەنەبیوەلا ناوە. ڕەنگە بایەخدانی زۆری موتەنەبی بەخۆی، شارەزانەبوون بە ژیانی کۆشكو ماستاونەکردن بـــۆ فەرمانڕەواکان، کەلێنـــی کردووەتە نێوان ئـــەوو فەرمانڕەواو تاوای لێهات لە کۆشـــکی بەدر دەرچوو، «ژیان وایە هەمیشە کەسە زیرەكو ســـەرکەوتووەکان، نەیاریان زۆرەو مرۆڤـــەکان لێناگەڕێن بەئاســـوودەیی دابنیشن؛ چونکە دەزانن کە خۆری ئەوان دەرکەوت، ئیدی چراکەی ئەوان، باوی نامێنێت».

دوای دەرچوونـــی لە کۆشـــکی بـــەدر، موتەنەبـــی ڕووی کردە دیمەشـــق، لـــە چیـــای جـــەرش لای «ئەبو حەســـەنی عەلی کوڕی ئەحمەدی خوراســـانی» لای دا، یەکدییان خۆشویســـتو ڕێزو وەفا لەنێوانیانـــدا هەبوو، ماوەیەك لەلای ئەبو حەســـەن حەوایەوە. بە چامەیەك پێیدا هەڵدەڵێت..

لا افتخار إلا لمن لايضام مدرك أو محارب لا ينام

پاشان لە ساڵی ٣٣٤ ڕۆیشت بۆ ئەنتاکیە، بۆ لای «ئەبو عەبدوڵای محمد کـــوڕی عەبدوڵایی کـــوڕی محمدی خەصیبی». لـــەو ماوەیەدا نامەیەکی لە داپیرەیەوە پێگەیشت، کە داوای لێکردبوو، بێت سەردانی بـــکات؛ چونکە تامـــەزرۆی بینینیەتی، بـــۆ بەدەمەوەچوونی داواکەی داپیـــرەی بەرەو کوفـــە بەڕێ دەکەوێت، بەڵام تا موتەنەبی گەیشـــتە کوفـــە، بەداخـــەوە داپیرەی کۆچـــی دوایـــی دەکاتو ماڵاوایی لە ژیان دەکات، کە بەم شێوەیە، لە پارچە شیعرێکیدا شیوەنی بۆ دەکات:

الا لا أرى الأحداث حمدا ولا ذما فما بطشها جهلا ولاكفها حلما

ئیـــدی دووبارە موتەنەبی ڕۆیشـــتەوە بۆ دیمەشـــق، لەو کاتەدا «ســـیف الدولة» لە شـــەڕدابوو لەگەڵ ڕۆمەکاندا، دەســـتی بەســـەر زۆرێك لە ناوچەی شامدا گرتبوو، سەرباری زۆریی شاعیر لە کۆشکی شاهانەی «سیف الدولة»، زۆر پێویستی بە شاعیرێکی گەورەی وەکو موتەنەبی بوو، تا ڕووداوو پاڵەوانێتییەکانی تۆمار بکات، کۆمەڵێك هۆنراوەی هۆنییەوە، کە بەشێکی دیاری دیوانەکەی پێك دەهێنێت.

## دیوانی موتەنەبی:

دیوانەکەی موتەنەبی، «٥٤٩٠» پێنج هەزارو چوارســـەدو نەوەد دێڕە شیعر لەخۆ دەگرێت، موتەنەبی خودی خۆی دیوانەکەی ڕێك خســـتووە، لەگـــەڵ قوتابییەکانیدا بەوانـــە خوێندوویانە. لە کۆنو نوێشـــدا، دیوانی هیچ شاعیرێك بەئەندازەی دیوانەکەی موتەنەبی، بایەخی پێ نەدراوەو ڕاڤەو لێکدانەوەی بۆنەکراوەو دانەری کتێبی «کشف الظنون» ناوی زیاد لە چل ڕاڤەی دیوانەکەی هێناوە.

زۆرێکیش لـــە ئەدیبانو ڕەخنەگران، لە ســـەردەمی خۆیەوە، تا ئێستە سەرقاڵی قاڵبوونەوەن لە دیوانەکەیدا، لەبەرئەوە ئیبن رشيق سەبارەت بە موتەنەبی دەڵێت: دونیای پڕ کردو خەڵکی سەرقاڵ کرد.

## کۆچی دوایی موتەنەبی:

موتەنەبی هەجوی کردۆتە سەر «ضبە کوڕی یزیدی ئەسەدی»، هۆنراوەیەکـــی توند، کە بەناوبانگتریـــن قەولی هۆنراوەکە ئەوەیە کە موتەنەبی دەڵێت:

مـــا انـــصـــف الـــقـــوم ضـــبـــه - وامـــــه الـــطـــرطـــبـــه
فـــلا بـــمـــن مـــــات فـــخـــر - ولا بـــمـــن عــــاش رغـــبـــه

ئەو کاتـــەی موتەنەبی دەیەوێت بگەڕێتـــەوە بۆ کوفە، لەگەڵ کوڕەکەی محسدو خزمەتکارەکەی مفلح، فاتکی کوڕی ئەبو جەهلی ئەســـەدی پێ دەگات کەخاڵی ضبەیە، موتەنەبی دەیەوێت ڕابکات، خزمەتکارەکـــەی، هەندێکیش دەڵێن کوڕەکەی پێی دەڵێت: بابە بۆ کوێ ڕادەکەیت، ئەی ئەم قسەیەی خۆت چی لێ دەکەیت:

الخيل والليل والبيداء تعرفنى والسيف والرمح والقرطاس والقلم؟!

موتەنەبیـــش پێـــی دەڵێـــت: بۆگـــەن بـــە کوشـــتت دام!

پاشـــان شـــەڕیان لەگەڵـــدا دەکات، تـــا ئـــەو ســـاتەی کوڕەکـــەیو خزمەتکارەکەیو خۆی دەکوژرێت، ئەم ڕووداوەش لە ٢٧ ڕەمەزانی ســـاڵی ٣٥٤ کۆچیدا بووە، لە نوعمانییە نزیك دير العقولی ڕۆژئاوای بەغداد.

سەبارەت بەو هۆنراوەی کە بووە هۆکاری لەناوچوونی، ئیبن ئەلعەدیـــم دەڵێت: موتەنەبی هیچ شـــیعرێکی نییە، لەم شـــیعرەی خراپتر بووبێت، شیعرێکی زۆر لاوازە، خراپیو نالەباری شیعرەکەی بووە هۆی کوشتنی خۆیو کوڕەکەیو تیاچوونی ماڵەکەی!

جەلال عەبدوڵڵا حاجی



# سەرچاوەی وزە..!

مرۆڤ بۆ بەردەوامبوون لە ژیان، پێویستی بە وزەیە، سەرچاوەی وزەی ئەندامی (ئۆرگانی)و تەنانەت نەوتیش دەگەڕێتەوە بۆ تیشکی خۆر، لە کۆندا سوودیان لە دار وەرگرتووە، وەك سەرچاوەی وزە، بۆ خۆ گەرمکردنەوەو ڕاپەڕاندنی ئیشو کارەکانیان، دواتر خەڵووزی بەردین، ئینجا نەوتو بەرهەمەکانی، پاشان گاز.

لەکاتی سووتاندنی دارو خەڵووزی ڕووەکیدا، هاوسەنگی ژینگەیی تێك ناچێت؛ چونکە لە سرووشتەوە بۆ سرووشتە، ئەو بڕە گازەی دەچێتە هەواوە، جارێکی تر ڕووەك سوودی لێ دەبینێتو خۆراکی لێ درووست دەکات، بەڵام لە ئەنجامی سووتاندنی نەوتو گازدا، ڕێژەیەکی زۆر گازی دوانۆکسیدی کاربۆن، دەچێتە هەواوە، دەبێتە هۆی تێکدانی هاوسەنگی ژینگەیی، زۆربوونی ڕێژەی ئەم گازە لە هەوادا، بووە بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لە بەرگە هەوای زەویدا، ئەمەش توانەوەی سەهۆڵی جەمسەرەکانی زەویو کارەساتە ژینگەییەکان بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

پیسبوونی ژینگە، گەورەترین کێشەیە کە ڕووبەڕووی مرۆڤ بووەتەوە، لە ئەنجامی جۆری ئەو وزەیەی بەکاری دەهێنێت، هەروەها تەواوبوونی ئەو وزەیەو نەبوونی جێگرەوەی نەوتو گاز کارەکە قورستر دەکات، مرۆڤ بەئارەزووی خۆی وازی لە دارو خەڵووزی بەردین هێنا، بە هۆکاری ئابووریو هونەری، ڕووی لە بەکارهێنانی نەوتو گاز کرد، نەك لە ئەنجامی نەمانو کەمبوونەوەی دارو خەڵووزی بەردین، بەڵام گەڕان بەدوای جێگرەوەی نەوتو گازدا، گۆڕانێکی ناچارییە، لە ئەنجامی کەمبوونو نەمانی ئەم جۆرە سەرچاوەیەی وزە.

ساڵانێکە توێژینەوەو داهێنانی بەردەوام دەکرێت، بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەیەکی وزەی نوێ، بەجۆرێك خاوێن بێت، هەروەها توانای نوێبوونەوەی هەبێت، کاریگەری خراپی لەسەر ژینگە نەبێت، بۆ ئەم مەبەستە سوود لە وزەی تیشکی خۆر، هێزی با، گەرمی ناواخنی زەوی، هێزی ئاو لەگەڵ وزەی ئۆرگانی وەردەگیرێت، ئەم سەرچاوانە بەردەوام نوێ دەبنەوە، بەڵام ناتوانن جێگەی نەوتو گاز بگرنەوە؛ چونکە نەوت سەرەڕای ئەوەی وزەیەکی زۆر دەداتو هەرزانیشە، لە هەمان کاتدا مادەیەکی خاوە لە پیشەسازیدا، نەوتو گاز ڕەوڕەوەی پیشەسازینو مادە خاوەکەشیەتی.

لە هەرێمی کوردستاندا، نەوتو گازێکی باش هەیە، بەشێکی وەبەرهێنانی تێدا کراوە، پاڵاوگەکان نەوتی خاو جیا دەکەنەوە بۆ بەرهەمەکانی، بەڵام ناتوانن بەتەواوی سوود لە نەوتەکە وەربگرن، واتە: هەموو ئەو مادانەی کە تێیدایە لێی جیا بکەنەوە، بەرهەمەکانیش بە کوالێتییەکی بەرز ناخرێنە بازاڕەوە، لەدوای قۆناغی جیاکردنەوە، (پاڵاوتن) قۆناغی گۆڕین دێت، ئێمە لەم بوارەدا کارگەمان نییە، گازی سرووشتی سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ سووتاندن، بەمەبەستی گەرمکردنەوەو چێشت لێنانو بەرهەم هێنانی کارەبا، بەڵام نەتوانراوە بۆ پیشەسازی پەترۆکیمیایی سوودی لێوەربگیرێت. لە پاش وزەی خۆر، وزەی کارەبا خاوێنترین جۆری وزەیە لەڕووی ژینگەییەوە، هۆکاری باشتربوونی گوزەرانی خەڵکییە، بەجۆرێك ژیان بەبێ کارەبا ئەستەمە، کارەکانی ڕۆژانە ئاسان دەکات، بووەتە هۆی خێرابوونی ژیان. کاتێك دەڵێین وزەیەکی خاوێنە، مەبەستمان لە وزەی کارەبا خۆیەتی، لە بەکارهێناندا ژینگە پیس ناکات، ڕەنگە سەرچاوەی بەرهەم هێنانەکەی هاوڕێی ژینگە نەبێت، دەبێت بزانین کارەبا لەچی بەرهەم دێت، ئەگەر سوود لە وزەی (نوێ بووەوە)وەربگیرێت بۆ بەرهەمهێنان، ئەوا ژینگە پیس ناکات، وەك تیشکی خۆر، هێزی ئاوو هێزی با، بەڵام بەکارهێنانی نەوتو گاز، خەڵووزی بەردینو تەنانەت وزەی ناوکیش، دەبنە هۆی پیسبوونی ژینگە.

وزەی خۆر لە کوردستاندا بەڕێژەیەکی باش هەیە، ڕۆژەکانی ساڵ درێژە، بەڵام تائێستا وەبەرهێنانی تێدا نەکراوە، ڕەنگە لە سەرەتادا پارەی کڕینەکەی زۆر بێت، بەڵام لە درێژماوەدا پارەیەکی زۆر دەگێڕێتەوە، دەتوانرێت بۆ گەرمکردنی ئاوی ماڵان، سوودی لێ وەربگیرێت، هەروەها وەك سەرچاوەیەك بۆ دابینکردنی کارەبا.

کارەبای هەرێم لە دوو سەرچاوەی وزەوە بەرهەم دێت، بەرهەمە نەوتییەکانو گاز، لەگەڵ هێزی ئاو لە بەنداوەکانەوە، نەبوونی سیاسەتێکی ڕوون بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر کەرتی کارەبای هەرێم، وای کردووە فشار لەسەر کەرتی کارەبا زۆر بێت، بەتایبەتی لەوەرزی سەرماوسۆڵەدا، بەهۆی سوودوەرگرتن لە کارەبا بۆ مەبەستی گەرمکردنەوە. لە ئەنجامی نەبوونی سووتەمەنیو نەبوونی هۆشیاری؛ چونکە لەکاتی گۆڕینی بەرهەمە نەوتییەکانو گاز بۆ کارەبا، ئەوا بەڕێژەی (٦٠٪) وزەکەی بەفیڕۆ دەچێت، کارەبای بەرهەمهاتوو بەشێکی ون دەبێت لەکاتی گواستنەوەدا، کاتێك لە نێو ماڵانیشدا کارەبا دەگۆڕین بۆ گەرمی، ئەوا هاوکێشەکە پێچەوانە دەکەینەوە، واتە: ئەگەر لە وێستگەی بەرهەمهێنانی کارەبا، دوو بەرمیل نەوت بسووتێنن بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا، کاتێك لە ماڵەوە کارەباکە دەگۆڕینەوە بۆ گەرمی، نزیکەی یەك بەرمیل نەوت گەرمیمان پێ دەدات، کاتێکی زۆرو وزەیەکی زۆر سەرف دەکەین، بەم کارە دوو هێندە ژینگە پیس دەکەین.

تێبینی: سوودم لەم سەرچاوە وەرگرتووە، چەند لێکۆڵینەوەیەك لە بواری سیاسەتی دابینکردنی وزەو پاراستنی ژینگە لە کوردستاندا- د.قەیوان سوارە سیوەیلی.



# جیمس وات

## (١٧٣٦ - ١٨١٩)

### کوڕی دارتاشێکی سادە، بوو بە بەناوبانگترین زانای وڵاتەکەی!

جیمس وات ئەندازیارێکی ئوسکەتلەندییە، داهێنەرو پەرەپێدەری بزوێنەری هەڵمییە، یەکەم کەسە کە بە پراکتیکی، توانای بە هەڵمبوونی تاقی کردۆتەوە، بزوێنەری هەڵمی سادە لە پێش زەمانی جیمس وات بەکارهاتووە، کە ڕێژەیەکی گەورەی لە خەڵووز سووتاندووەو بەرهەمێکی کەمی بەخشیوە، هەروەها جووڵەی گۆڕانکاریش (لە بەردەمو لە پشتەوە) دیاری کراوەو بەکارهاتووە بۆ کارپێکردنی موزەخە.. لەم نێوەندەدا جیمس وات داهێنانێکی چڕوپڕی جیاوازی داهێنا، ئەویش بە گۆڕینی هەڵمی ئاو، جارێکی تر بۆ ئاو بە ساردکردنەوە، واتە چۆن لە سەرەتادا ئاو گۆڕاوە بە هەڵم، بە هەمان شێوە داهێنانەکەی جیمس وات، دووبارە هەڵمی گۆڕیوەتەوە بە ئاو، بە زیادکردنی توانای بزوێنەرە هەڵمییەکان، هاوکات چاکسازییەکانی ئەم دواییەی بووە هۆی ئەوەی بە ڕێژەیەکی زۆر بەکار بهێنرێت، ئەو چاکسازییانەش بە شێوەی نایابو ناوازە، پشکیان لە پێشکەوتنی پیشەسازی نوێدا هەبووە.

وەك ڕێزێك بۆ ئەو داهێنانو پشکانەی جیمس وات، کە لە پیشەسازی نوێدا هەیبووە، دکتور مایکل هارت، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا، لە نێوان ئەو سەد کەسەی کە گەورەترین کاریگەرییان لەسەر ژیانی مرۆڤایەتی هەبووە، پلەی بیستو پێنجەمی بە جیمس وات بەخشیوە، کە ئەو کتێبە بەناونیشانی (سەد یەکەمینەکان) نووسراوەو بە یەکێك لە کتێبە جیهانییەکان دادەنرێو هاوکات بە یەکێك لە کتێبە پڕفرۆشەکان مەزەندە دەکرێت، کە بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕدراوە.

### ژیانو لە دایکبوونی جیمس وات:

لە ساڵی ١٧٣٦ زاینی لە جرینوك لە وڵاتی ئوسکەتلەندە لەدایك بووە، جیمس وات کوڕی دارتاشێکی سادە بوو، وەك هەر منداڵێکی دیکەی وڵاتەکەی، چووەتە قوتابخانەی حکومی، بەڵام بە هۆی کۆمەڵێك ئاستەنگو نارەحەتی، کە دوچاری جیمس وات بوو، نەیتوانی لە قوتابخانەی حکومی بەردەوام بێت، لەبەرئەوە وازی لە قوتابخانەی حکومی هێنا..

کاتێك تەمەنی گەیشتە هەژدە ساڵ، کۆچی کرد بۆ جلاسجو، لەوێوە ڕۆیشت بۆ شاری لەندەن، بۆ فێربوونی پیشەسازی ئامێرەکانی تایبەت بەزانستی بیرکاری، وات لە پیشەکەیدا توانی سەرکەوتنی بەرچاو بەدەست بهێنێت، بەشێوەیەك کە جێگەی سەرسامی زانای فیزیایی (جوزیف پلاك)بوو، (داهێنەری بزوێنەری شاراوە)؛ کە بوو بە دروستکەری ئامێرەکان لە زانکۆی گلاسگۆ لە ساڵی ١٧٥٧.

پەیوەندیی هاوڕێیەتی نێوان جیمس واتو جوزێف پلاك، کاریگەرییەکی دیاری کردە سەر ئاڕاستەکردنی جیمس وات، بۆ گرنگیدان بە وزەو تواناکانیو سوودوەرگرتن لە هەڵم، کە وەکو هێزێك بۆ بزوێنەر، سوودی لێ بینی، وات دوای ئەوەی چەند ئەزموونێکی لەو بوارەدا تاقی کردەوە، دواجار بزوێنەری هەڵمی لە جۆری (نیوکومن) کەوتە دەستی لە ساڵی ١٧٦٣، دوای ماوەیەك وات، ئامێری هەڵمینی چڕترو جیاوازتری داهێنا، بە مەبەستی چاکسازیکردن لە ئامێری هەڵمیدا، چەندین ئامێری دیکەی خستە نێو بزوێنەری هەڵمییەوە، لەوانە موزەخەی هەوایی، بەرگی لوولەکی هەڵمی، پێوەری هەڵم، هەموو ئەمانەش

بوونە هۆی ئەوەی کە ئەو بزوێنەرە ببێت بە مەکینەیەکی بازرگانیی زۆرباش، کە توانای دەستاوەدەستکردنو بەکارهێنانی هەبوو، دواجار ساڵی ١٧٦٩ بڕوانامەی داهێنانی لەسەر بزوێنەرە هەڵمییەکە وەرگرت.

لە بزوێنەری (نیوکومن) لە ژێر گوشاری هەواداو لە نێو لولەکەکە "سلندەرەکە"ی پڕ دەبوو لە هەڵم، کاتێك هەڵمەکە چڕ دەبێتەوە، گوشارگرەکە پاڵی پێوە دەنێت بە پەستانی دەرەوە..

ئەمەش واتە: گەرمکردنو ساردکردنەوە بە نۆرە، کە دەبێتە هۆی ونکردنی ڕێژەیەکی زۆر لە وزە، لێرەدا جیمس وات هەستی کرد، کە هەڵمی ئاوی گەرم، تەنها پێك هاتووە لە هەڵمێکی نەرمو شل، لەبەرئەوە بچێتە هەر دەفرێکەوە پری دەکات، ئەگەر لولەکە پڕ لە هەڵمەکە بکرێتەوە، ئاوەکە لە دەفرەکەدا بە ساردی دەمێنێتەوە، لە کاتێکدا هەڵمەکە بۆ جاری دووەم لە دەفرەکەدا دەجووڵێنرێت، سەرلەنوێ چڕ دەبێتەوە، بۆشاییەك لە لوولەکەکەدا دروست دەکات، بێئەوەی پێویستی بە ساردبوونەوە هەبێت..

وات چەند ساڵێك هەوڵی دا، کە بزوێنەری کارپێکردن پەرە پێ بداتو دیزاینێکی نوێی بۆ بکات..

لە ساڵی ١٧٧٤ توانی پشتگیری ماثیوبولتون بەدەست بهێنێت، کە خاوەنی کارگەیەکی چالاکو پربەرهەم بوو لە شاری بیرمینگهام، ئەم دووانە، واتە: جیمس واتو ماثیوبولتون کۆمپانیایەکی ئەندازیارییان بە ناوی کۆمپانیا (سوهو بۆ ئەندازیاری) دامەزراند، کە کاریان بە کرێگرتنی دیزاینی نوێو سەرپەرشتیکردنو درووستکردنو کارپێکردنی بوو، لە ڕاستیدا کۆمپانیاکەیان توانی سەرکەوتن بە دەست بهێنێت، ئەم دوو هاوبەشە زاراوەی توانای ئەسپیان لە بواری تواناو وزە میکانییەکاندا بەکارهێنا، بەم شێوەیە کە توانای یەك ئەسپ یەکسانە ٠،٧٤٦ کیلۆوات.

لە ساڵی ١٧٨٢ جیمس وات بڕوانامەی داهێنانی لەسەر بزوێنەری هەڵمی تێکەڵ وەرگرت، کە پەستانی هەڵمەکە بە هۆی پاڵێوەنانی ئیستۆپەوە، بۆ هەردوو ئاراستە بەکار دێت، هەروەها پەرەی بەستنەوەی جووڵەی هاوتەریب بۆ گۆڕینی جووڵەی ئالوگۆڕدا، لەژێر گوشاری ئیستۆپ لە ئامێری لەرەلەرکەرەکەدا، کە ناودەبرێت بە کۆڵەکەی کارپێکردن، کۆڵەکەی کارپێکردن ڕۆڵی گواستنەوەی جووڵە دەگێڕێت.

جگە لەوانەش وات زەمانەیەکی بۆ ڕێکخستنی خێرایی بزوێنەرەکەو زۆرێك لە ئامێرەکانی دیکە دانا. هەروەها چەندین توێژینەوەی زانستی لە بواری کیمیاو کانزاناسیدا ئەنجام داوە، هەروەها یەکێکە لەو یەکەمینانەی پێیان وایە، کە ئاو ئاوێتەیە، نەك توخم، جیمس وات دوای داهێنانگەلێکی بەسوود لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە خانەنشین بوو، کە لەو کاتەدا بووبوە کەسێکی دەوڵەمەندو شکۆدار. هاوکات یەکەیەکی وزە کرا بەناوی (وات)، وەکو ڕێزێك بۆ داهێنانو ماندووبوونەکەی. دواجار لە ساڵی ١٨١٩ بۆ هەمیشە وات ماڵاوایی لە ژیان کرد.

ن: سانتیا سالگا
و: سەروەر عومەر

# من بە فەرمی دەست لە گەورەیی دەکێشمەوە

بەم شێوەیە من بەفەرمی دەست لە گەورەیی دەکێشمەوەو بەرپرسیارێتییەکانی منداڵیکی هەشت ساڵانە لە ئەستۆ دەگرم.

دەمەوێ بچمە نێو دوکانێکی لەفەفرۆشییەوەو وا بیر بکەمەوە، ئەوێ چێشتخانەیەکی پێنج ئەستێرەیە.

دەمـەوێ وا بیر بکەمەوە، شکولات لە پارە باشترە؛ چونکە دەتوانم بیخۆم!

دەمەوێ لە ژێر داربەڕوویەکی گەورەدا دابنیشمو لەگەڵ هاوڕێکانم ساردەمەنی بخۆم.

دەمەوێ لە نێو چاڵێك ئاودا کایە بکەم، کۆلارەکەم بۆ ئاسمان هەڵبدەم.

دەمەوێ بۆ ڕابوردوو بگەڕێمەوە، بۆ ئەو کاتەی هەموو شتێك سادە بوو..

ئەو کاتەی خەریك بووم، ڕەنگەکانو خشتەی لێکدانو شیعرە منداڵانەکان فێر دەبووم..

ئەو کاتەی نەمدەزانی چ شتێك نازانمو هیچیش بە لامەوە گرنگ نەبوو.

دەمەوێ وا بیر بکەمەوە، دونیا چەند جوانە، هەموان ڕاستگۆو باشن.

دەمەوێ باوەڕ بهێنم بەوەی هەموو شتێك ڕێی تێدەچێت.

دەمەوێ لە ئاڵۆزییەکانی دونیا بێئاگا بم.

دەمەوێ دووبارە بۆ هەمان دونیای سادەیی خۆم بگەڕێمەوە..

نامەوێ ژیانم پڕ ببێت لە فەرمانی کارگێری، وەسڵو سزاو هەواڵە ناخۆشەکان. دەمەوێ باوەڕ بە زەردەخەنە بهێنم..

بە وشەیەکی خۆشەویستیئامێز..

بە دادپەروەریی..

بە ئاشتی..

بە فریشتەکان..

بە بارانو بە.....

فـەرمـوون: ئـەوە دەستە چەکەکەم، سویچی ئۆتۆمبێلەکەم، ناسنامەو تەواوی بەڵگەنامەکانی ترم.... بۆ ئێوە....

من بەفەرمی دەست لە گەورەیی دەکێشمەوە....



بەشی یەکەم

# تۆ چ جۆرە باوکێکی؟

ن: دکتۆر مستەفا ئەبوسەعد
و: خالید موحەممەد

## پێناسێك بۆ جۆرەکانی باوكو سیفەتە باشو خراپەکانیان

پێم وابێ زۆر قورسە قسە لەسەر باوکێکی نموونەیی بکەینو بتوانین لیستێك دابنێین لە سیفەتە باشەکان کە پێویستە لە کەسێکدا بن تاکو نازناوی (باوکی نموونەیی) پێ ببەخشرێت، لە هەمان کاتیشدا ناکرێت هەمیشە جەخت لەسەر ڕۆشنبیریکردنو ئامادەکردنو فێرکردنی باوکان بکەینەوەو فێریان بکەین چۆن بنو پێویستە چۆن مامەڵە بکەن؟ لەبەر ئەوە هەوڵ دەدەم لە ڕوانگەی ئەو ئەزموونانەی کە کۆم کردوونەتەوە لەڕێی تێکەڵاویم لەگەڵ باوکانو منداڵەکانیانو بە دواداچوونی کێشە کردارییەکانیانو ئەو ئاکارانەی کە وێنەی منداڵ بە جۆرێك دەکێشێت، کە باوك دەکاتە کەسێکی ناباشو دەسەوسان لە بەرامبەر بەئەنجامگەیاندنی ئەرکی سەرشانی، بەڵکو دەگاتە ئاستێك، کە ناوی (باوکایەتی) لێ بسەنرێتەوە، هەوڵ دەدەم لەم ڕوانگەیەوە وێنەکە بخەمە ڕوو.

هەروەها جۆرەکانی باوك دەناسێنین؛ تا هەریەك بزانێ خۆی لە کامیاندا دەبینێتەوە، پاشان باشیو خراپی ئەو جۆرە باوکە بزانێتو کار لەسەر خۆی بکات، تا ببێت بە باوکێکی نموونەیی.

**شێوازەکانی باوکایەتی...ئاگاداریان بە**

**١- زاڵبوون: (باوکسالاری)..**

کرداری زاڵبوونو خۆسەپێنی، یان (باوکسالاری)و حەزی زاڵبوون، وێنەی باوکێکی تەقلیدییە، کە تا ڕادەیەك ئێستەش لە زۆرێك لە کۆمەڵگەکان بەکارەو قبووڵکراوەو پەیڕەو دەکرێت، زۆرجاریش لەمیانەی ئەو خورەوشتو نەریتانەوە جێبەجێ دەکرێت، کە باڵیان کێشاوە بەسەر کۆمەڵگەو خێزانەکاندا.

ئەو ترسانەی کە کرداری زاڵبوونو خۆسەپێنی لە باوکدا دەوروژێنن، زۆرو مەترسیدارن، ئەو دەسەڵاتەی کە لە میانەی باوکایەتییەوە جێبەجێی دەکات، وای لێ دەکات چەند هەڵوێستێکی هەبێت، نەك لەبەرئەوەی باوەڕی پێی هەیە، بەڵکو تەنها لەبەرئەوەی کاری (باوکایەتی)یەکەی دەیسەپێنێت بە سەریدا، بەمەش وێنەی باوك وەك دامەزراوەیەکی تەقلیدی کۆمەڵایەتی، زاڵ دەبێت بەسەر وێنەی باوکی ڕاستەقینەدا، ئەو شتەی کە دەیکاتە دیلی وێنەیەکی دیاریکراوو لەدەستدانی کەسایەتییە کاریگەرەکەی، زۆرجاریش وای لێ دەکات ڕۆبچێت لە گێژاوەکانی ململانێ دەروونییەکانی ناو خودی خۆیدا، لە نێوان ئەو بیرو ڕایانەی کە خۆی باوەڕی پێیەتیو ئەو شتانەی کە باوو خووەکان دەیسەپێنن.

(زۆرجار ئەم جۆرە باوکانە، پێیان وایە وازهێنان لە کرداری خۆسەپێنی، ئەگەر بە پێکەنینێکی کەمیش بێت، لەسەر کورسی شاهانە دایاندەگرێتە خوارەوەو بەرەکە لەژێر پێیان دەردەهێنێت)!.

**A- لایەنە خراپەکانی باوکسالاری:**

**أ- ماندوبوونی بەردەوام:**

سووربوونی باوك لە پارێزگاریکردنی ئەو وێنەیە، زۆر ماندووی دەکات، لەبەر ئەوەی دای دەماڵێت لە مامەڵەی ئاسایيو زۆرێك لە قورسایی بەردەوامی دەخاتە سەرشان، کە دەرەنجامەکەی کێشەو ماندوبوونە، بەدەست باوکایەتییەوە، دواجار لە کارەکەی خۆی بێزار دەبێت، یان ڕقی لێی دەبێت.

(چەند مرۆڤ توندو سەختگیر بێت لە هەڵوێستەکانیدا، هێندە واز لە مرۆڤێتیی خۆی دەهێنێت لەبەرامبەر منداڵەکانی، بۆ ئەوان دەبێتە ئامێرێکی تایبەت بە دەرکردنی بەڵێو نەخێر).

مرۆڤایەتیی مرۆڤو ڕۆڵی خۆسەپێنی لەیەك کەسدا کۆ نابێتەوە، کاتێکیش باوك لەناو خێزانەکەدا، مرۆڤێتیی خۆی لەدەست دا، کاریگەریی ناباشی لەسەر کۆمەڵگە بەگشتی دەبێت.

**ب- گۆێزانەوەی وێنەکە بۆ نەوەکان:**

ناباشییەکانی خۆسەپێنی تەنها لە باوکدا ناوەستێت، بەڵکو دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکان، بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە، کە باوکێکی گەنج ببینی، پەیڕەوی باوکایەتییەکەی بکات بە شێوازێکی توندو خۆسەپاندن؛ چونکە وێنەی باوکی تەقلیدی تێدا بەرجەستە بووە، کێشەی گەورەش تەنها خۆسەپێنی لە باوکی گەنجدا نییە، بەڵکو لە نەگونجانی کەسێتییەتی (زۆر جار) لەگەڵ ئاکاری خۆسەپێنی، ئەمەش وای لێ دەکات زیادەڕەوی بکات لە هەڕەشەو بڕیاری سزاو گاڵتەجاری.. ئەوشتەی کە خێزان دەکاتە گۆڕەپانی ململانێو جیاوازیو یەکتر تۆمەتبارکردنو بڕیاری سزادانو ژینگەیەك کە ژیان تێیدا زۆر ئاستەمو قورس دەبێت، ژینگەیەك هیچ پەیوەندییەك لە نێوان تاکەکانیدا ناناسێت، تەنها لە بواری (وا مەکەو وا بکە)دا نەبێت.

(هەڵوێستی منداڵەکان، سەبارەت بە ئەمە، یان سەرکەشیو پارێزگاری لەخۆکردن دژی ئەو ستەمکارییە دەبێت، یان ملکەچبوونو وەرگرتنی کردارەکە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا لەبەردەم چەند کردارێکدا خۆمان دەبینینەوە، کە پێویستیان بە چارەسەرو ڕاستکردنەوەیە).

# دەرمانی کێشە دەروونییەکانی خۆت بکە

واضح فەرەج

هەروەك چۆن خانوویەك، لەژێر فشاری بومەلەرزەیەکدا دەقڵیشێتو دادەڕووخێت، هەرئاوهاش مرۆڤ بەهەمان شێوە لە ژێر کێشە دەروونییەکانیدا، فشار دەکەوێتە سەری‌و ژیانی بەرەو کارەساتی دڵتەزێن دەبات.

ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەش پێدەچێت وەستانی دڵ، یان نەخۆشییەکی مەترسیدار، یان کوشتنی منداڵی خۆت، یان خەڵك، یان لێکهەڵوەشاندنەوەی ژیانی هاوسەرێتی، وێڕای چارەسەرکردنی کێشە دەروونییەکان، ئەو کات دەتوانین جڵەوگیری لەو کارەساتانە بکەین کە ئاماژەمان پێدان.

کەواتە: ئەگەر خانوویەکی بەهێزو بناغەی باش لێ درابێت، ئەو کات بومەلەرزەکەش کاریگەری کەمتر دەبێت.

لێرەدا دەتوانین، کێشە دەروونییەکانمان لەچەند خاڵێکدا دەست نیشان بکەین، پاشان پشت بە خودا باسی چارەسەری گونجاویش دەکەین.

**(کەسی دەروونئاڵۆز ئەم کێشانەی هەیە)**

١. بیرکردنەوە لەڕابوردووی تاڵ.

٢. نائاسوودەیی.

٣.هەستی ڕق لێبوونەوە.

٤.کەس خۆشنەویستن.

٥. هەست بە سەرکوتکراوی.

٦. نەبوونی متمانە بەخودی خۆت.

٧. نیگەرانی بە بەردەوامی.

٨. هەستکردن بە تەنهایی.

٩. ترسی بەردەوام.

١٠. ڕاچڵەکین لە خەودا.

ئەو چەند خاڵەی باسمان کرد، هەمووی خاڵی جەوهەری‌و بەزەقی لەکەسی دەروونئاڵۆزدا دەبینرێت. ئەمانە دەبن بەمایەی سووتان‌و فەوتانی تەواوی ژیانی ئەو کەسە دەروونئاڵۆزە، چجای ئەوەی کاردانەوەی خراپیشی بۆ کۆمەڵگا دەبێت. ئەگەر مامۆستا بێت زەرەر لە خوێندکارەکانی دەدات، یان فەرمانبەر بێت، زیانی بۆ کارەکەی هەیە. بەهەمان شێوەش ئەگەر دکتور بێت، زیان لە نەخۆشەکان دەدات. ئەگەر کاربەدەستێکی گەورەش بێت، زیانی بۆ وڵات هەیە، یان کەسێکی سادەش بێت، زیانی بۆ ناوبازاڕو شوێنە گشتییەکان هەیە.

کەواتە: نەخۆشیی دەروونی زۆر کوشندەترە لە نەخۆشیی شێرپەنجە؛ چونکە ئەو کەسەی شێرپەنجەیەتی، تەنها خۆی لەناو دەچێت.

لێرەشدا چارەسەر لەچەند خاڵێکدا دەخەینە ڕوو، ئەو کات کەسی دەروونئاڵۆز، دەتوانێت پەیڕەوی ئەم خاڵانە بکات وردەوردە پشت بە خودا دەبێتەوە بە کەسێکی سرووشتی.

١. وازهێنان لە هەموو ئەو بیرکردنەوە نەرێنی‌و خراپانەی کە لەدەستنیشانکردنی کەسی نەخۆشدا خستمانە ڕوو.

٢. بەپێی توانا وەرزشکردن، یان جێگۆڕکێ‌و هاتنە دەر لەماڵەوە بۆ باخچەیەك.

٣. ناسینی خودا ئەگەر خودامان ناسی، ئەو کات زۆر لە کێشە دەروونی‌و پرسیارەکانی مێشکمان، وەڵام دەدرێنەوە.

٤. دوورکەوتنەوە لە هاوڕێی خراپ بەتایبەتی ئەو هاوڕێیانەی کە ئازاری دەروونت دەدەن‌و بەکەم دەتنرخێنن.

٥. هەمیشە هاوڕێیەکی چاك بە بۆ خۆت لەناختدا وەسفو سەنای خۆت بدە، بەڵام بەمانای لووتبەرزی نا؛ چونکە لووتبەرزیش نەخۆشییە.

٦. باش بیرکردنەوە، واتا باش بیر لە هەموو شتێك بکەرەوە، ئینجا بڕیار بدە؛ چونکە زۆر بڕیار هەن، تەواوی پاشەڕۆژت دەستنیشان دەکەن.

٧. بیری باش، با بە مێشکتدا بێت؛ چونکە (کە ئاگات لە بیرکردنەوەکانت دەبێت، دەبێت بەو شێوە ئاگاشت لە وشەکانت بێت، کە دەبن بەکردارو ئاگاشت لەکردارەکانت بێت، دەبن بە خوو، ئاگاشت لەخووەکانت بێت، پاشەڕۆژت دەست نیشان دەکەن).

٨. ئەنجامدانی کاری چاك، شەرت نییە بەپارەبێت. گرنگ ئەوەیە تۆ کارێکی چاك بکەیت، وەك پەڕاندنەوەی نابینایەك لەشەقام. قسەی خێر بۆ خەڵك. یان تێرکردنی گیاندارێك ئەگەر بە پارچەنانێکیش بووە ئەوکات لێرەوە تۆ هەست بە ئارامیی دەروونی دەکەیت‌و چارەسەرت وەرگرتووەو هەستی ئاسوودەییت تێدا درووست بووە، ئینجا دەزانیت دەروونی تۆ لە چ بەندیخانەیەکدا شەووڕۆژی کردۆتەوە.

خوێنەری بەڕێز، گومانی تێدا نییە عەقڵی مرۆڤەکان، وەك حاکم وان لەمێشکی مرۆڤدا. ئەگەر باش بیر بکەینەوە؛ ئەوکات حاکمی ناومێشکمان باش بڕیار دەداتو ژیانمان پڕ دەبێت لە ئاسوودەیی‌و خۆشی. ئەگەر خراپ بیر بکەینەوە، ئەوکات حاکمی ناومێشکمان، خراپ بڕیار دەدات بەرەو زیندانی هەتاهەتایی‌و هەموو تاڵی ڕوو دەکاتە ژیانمان. کەواتە: باش بیرکردنەوە، زۆر گرنگە لە خۆت، یان لە خەڵك، یان لە هاوسەرتو هتد...

لە کۆتاییدا، با بەوێنەی گوڵو پەپوولەو زەردەخەنە، ژیانمان ڕازاوە بکەین. ئەو تەمەنە کورتەی دونیا، پڕ بکەین لەخۆشی‌و شادی، چرابین بۆ نەوەی داهاتوومان. بە هیوای کۆمەڵگایەکی تەندرووستو تاکی بەختەوەر.

# نزایەک بۆ پاشا..

لە فارسییەوە: کارزان مەحموود



لە ڕۆژگاری زوودا، پاشایەکی بەدەسەڵاتو پڕشکۆو خاوەن سەروەتو سامان هەبوو، ئەم پاشا بەدەسەڵاتە، تووشی نەخۆشییەکی دەگمەن دەبێت، لە جێگادا دەیخاتو ناتوانێت هەنگاوێك بە پێیەکانی خۆی بڕوات، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام ئازاری هەبوو، هەموو حەکیمانی مەملەکەت دێنە سەری؛ بۆئەوەی چارەیەکی پاشا بکەن، بەڵام هەوڵەکانی هەموان بێسوود بوو، تا دەهات نەخۆشییەکەی پاشا خراپترو سەختر دەبوو.. ڕۆژێك یەکێك لەخزمەتکارەکانی پاشا وتی: پاشام من پیاوێك پێدەزانم لەم شارەدا، کەخوداناسو لەخواترسێکی دیارە، کەسێکی پاكو کار ڕاستە، هێندە دڵ ڕۆشنو پارێزکارە، هەرکات نزا دەکات بەزوویی گیرا دەبێت، ئەگەر مۆڵەت بدەیت، دەچم لەو چارەیەك دەخوازم..؟!!

پاشا...چونکە هیچ چارەیەکی تری نەبوو، ڕێگەی دا، کە پیاوە خواناسەکە بهێننە کۆشك.. کاتێك کە پیاوەی خواناس دەگاتە کۆشکی پاشا... هەموان لەشێوەو ڕوخسارو ڕەفتاری سەریان سوڕما، پیاوەی خواناس خاوەنی لاشەیەکی بچووكو بەرگوپۆشاکێکی هەرزانو هەژارانەی لەبەردابوو، سەری داختسبوو، هێواش هێواش لەژێر لێوەکانییەوە یادی خودای دەکرد، نەسەیری هیچ کەسێکی کردو نەڕوانی بۆ هیچ کەسێك.. پاشا ڕووی کردەپیاوە خواناسەکەو بەدەم ناڵەو ئازارەوە وتی: ئەی پیاوی خودا..!! دەردم گرانە، ئازاری بەردەوامم ئارامی لێبڕیوم، دەڵێن: کە نزای تۆ گیرایە، بۆ سەلامەتیی من، نزایەك بکە.. پیاوەی خواناس سەری بەرز کردەوەو سەرنجی چاوەکانی پاشای دا، پاشا لە جۆری سەیرکردنەکەی زۆر ترسا؛ چونکە بەو شێوەیە مایەوە، تا ماوەی چەند خولەکێك، دوای ئەوە کەوتە قسەکردنو وتی: ئەی پاشا، بیر لەچی دەکەیتەوە؟ وا بیر دەکەیتەوە، کە من نزا بکەمو بەزووترین کات، نزاکەم بۆت گیرابێت؟ ئەوە ڕاستە کە خودای گەورە بەسۆزو میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانیدا، بەڵام میهرەبانیی خودا، بۆ کەسانێکە کە گوناهو تاوانیان نییە، کاری خراپ ئەنجام نادەن، خراپترینی تاوانەکانیش ستەمکردنەو نادادیە لەگەڵ بەندەکانی خودادا.. تۆ ئێستا ئەنجامدەری ئەم تاوانە گەورانەیت..!! ئیتر چۆن دەبێت خودای گەورە نزای من، بۆ تۆ گیرا بکات؟ خودای گەورە نزای من بۆ کەسێك گیرا دەکات، کە دادپەروەرو یەکسان بێت بەرامبەر بە خەڵکی زوڵمو ستەمیان بەرامبەر نەکات.. پاشا ...تۆ بە من بڵێ یەکسانیو دادپەروەریی تۆ کوا..؟ تۆ کوا دادپەروەریت؟! لەژێر دەسەڵاتی تۆدا، زیندانەکان پڕکراون لە کەسانی بێتاوانو ئەشکەنجەو ئازاردەدرێن..؟! بۆچی خەڵکی وڵاتی تۆ دەبێت هێندە هەژارو نەداربن، ژیان بە مەمرەو بژی دەبێت بەرنە سەر؟! بۆچی ئەو سەروەتوسامانەی وڵات لە نێوانیاندا بەیەکسانی دابەش ناکەیت، کە هەرخۆیان خاوەنین!! ئێستا هەرچەندە من نزا بکەم؛ چونکە ئاهو ناڵەی ستەم لێکراوانت لەسەرە، هیچ سوودی بۆت نییە!! پیاوەی خواناس ئەم قسانە دەکاتو کۆشك بەجێ دەهێڵێتو دەڕوات، بەلای پەرستشی خۆیەوە.

پاشا کاتێك ئەم قسانە دەبیستێت، لە پیاوەی خواناس، بیری کردەوە، وتی: هەرچیت وت ڕاستەو حەقیقەتە، دەبێت هەتا زووە دەستبەکار بم، پاشا فەرمانی کرد: هەرچی زیندانی بێتاوان هەیە ئازادیان بکەنو قەرەبوویان بکەنەوە، بە خەزێنەداری ڕاگەیاند، هەرچی سەروەتو سامانی وڵات هەیە بۆمی بهێنە، هەمووی بەسەر هەژارانو نەدارانی وڵاتدا دابەش کرد، هەرچی کاربەدەستە ستەمکارو گەندەڵکارەکانیش بوو دووری خستنەوەو لەسەر کار لای دان...

کاتێك ئەم چاکسازییانەی لە وڵاتدا ئەنجام دا، پاشا زۆر هەستی بەئاسوودەیی کرد، کاتێك پیاوەی خواناس بەچاکسازی پاشای زانی، چوویەوە بۆ کۆشك بۆ لای پاشا...بەپێکەنینەوە وتی: ئێستا هەستەو بڕۆ خۆت بشۆو نوێژ بخوێنە بۆخودا!! پاشا زۆر سەری سوڕما لە قسەکانی پیاوەی خواناس، وتی: بەڵام من ناتوانم بیمارم!! پیاوەی خواناس وتی: بۆچی ناتوانی..!خودای گەورە لەکارەکەی تۆ ڕازی بوو، نزاکەی منیشی بۆ تۆ گیراکرد، تۆی شیفا دا، ئێستا تۆ تەواو چاك بویتەوە!! پاشا هەستایە سەرپێو هیچ ئازارو ناڕەحەتیو بیمارییەکی نەمابوو، ساغیو سەلامەتی بۆ پاشا گەڕایەوەو پاشا زۆر خۆشحاڵ بوو، هەردوو دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمانو وتی: خودایە سوپاس ....خودا گیان سوپاست دەکەم، گریا ...گریا ...بەچەشنی باران فرمێسك بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارێ..

سەرچاوە...مجلە کیهان/ئەویش لە بستان سعدی..



# فەرمانڕەوای خەمخۆر

بوشرا ئەبوبەکر

لــە دێــر زەمانـدا پادشــایەکی چاکەکارو دادپــەروەر هەبوو، وڵاتێکی ئارامو پڕ لە ئاشــتی بۆ خەڵکەکەی دابین کردبوو، باسی میهرەبانیو خۆشەویستی پادشــا لە سەرانسەری کیشوەر بووبوو بە وێردی ســەر زمانی خەڵك، کەسێك نەبوو لە دەستی ناڕازیو بێزار بێت، ئەم پادشایە هیچ گرنگی بە کۆشكو تەلارو تەنانەت جلو بەرگیشــی نەدەدا، ڕۆژێك بەردەستەکانی داوایان لێکرد، کە لــە جێگەی ئەو جلە کەمنرخو ســادانەی جلی بەنرخو کەموێنە بپۆشــێت کە لە ئاوریشــم دروســت کرابێتو بە زێڕو ئەڵماسی گرانبەها ڕازابێتەوە، کە شایەنی پلەوپایەی پاشایەتیی ئەو بێت، بەڵام پادشا وەڵامی دانەوە:

هــەر ئــەم پۆششــە بێبەهایانــە، مایــەی ئاســوودەییو خۆشــگوزەرانیو بێخەمی منن، مــن لەمە زیاتر بۆ خۆم بە ڕەوا نابینــم، من لەو پادشــایانە نیم، کە لە خەڵکــی وڵاتەکەم باجو خەراجــی زۆر وەربگرم؛ تــا زێڕو زیوو ئاوریشــمی بۆ خۆم پێ بکڕمو لە تەختی پادشایەتیمدا سەرفی بکەم، زۆر پادشا هەن، کە بە ئەندازەی کەسێکی گوندنشین، تامی ئاسوودەییو خۆشبەختیان نەکــردووە، مــن نامەوێت وەك ئەوان ببمە مایــەی بەدبەختیی خــۆمو خەڵکی وڵاتم، منی پادشــا گەر وەك ژنــان جلو بەرگی بەنــرخو ڕازەوە لەبەر بکەم، چۆن دەتوانم مەردانە دوژمنان لە وڵات دوور بخەمــەوە، مەردایەتیو ئازایەتی لە کردارو شــێوازی ژیانی مرۆڤ دەردەکەوێت، نەك لە پۆشاكو کۆشكو تەلار.

منیش وەك هەموو پادشــایەك، ئارەزوو خەیاڵی زۆرم هەیە، بــەڵام خۆ خەزێنــەی دەوڵەت، بــۆ من نییە، بەڵکــو دەبێت لە کاروباری گرنگیــی وڵاتو خەڵکدا بەکاری بهێنمو ببێتە هۆکاری ئاسوودەییو سەلامەتیو خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی وڵات.

هەروەها خەزێنەی دەوڵەت بۆ پێداویستی سوپاو دابینکردنی ژیانی بێدەردەســەرییە بۆ سەربازان، نەك بۆ زێڕوزینەتی پادشا. گەر ســەربازان لە ئاســایشو ئاســوودەیی تەواو نەبنو بزانن کە خانەوادەکانیــان پــاش ڕۆیشــتنی ئەمان، لە هــەژاریو نەداریدا دەژیــنو دەوڵەت نابێت بە سەرپەرشــتیاریان؛ ئەوا چۆن ئامادە دەبن بجەنگێنو پارێزگاری سنوورەکان بکەنو لە گەڵ دوژمناندا دەستەویەخە ببنو دڵسۆز بن بۆ خاكو پادشا.

بەشــێك لــە داهاتی دەوڵــەت لــەو باجەیە، کە لــە خەڵك وەردەگیرێــت کەواتــە: دەبێــت بــۆ خزمەتــی خۆشــیان بەکار بهێنرێتو سەلامەتیو ئاسایشیان دەبێت بۆ دابین بکرێت.

زۆربــەی خەڵك، بەتایبەتی جوتیــاران، وەك درەختێك وان، کە ئەگەر بە جوانی گرنگییان پێ بدرێتو لە ئاوو خاکێکی پاك گــۆش بکرێن؛ ئەوا زۆر ســوودمەند دەبیت لە بەری میوەکەیان، نابێت بە جەورو ستەم، ڕەگی ئەو درەختانە وشك بکرێن، تەنها نەزانەکان ئەو کارە دەکەن.

زوڵمو ســتەمکردن لــە کەســانی بێتواناو نەدار، نیشــانەی مەردایەتــیو ئازایەتــی نییە، بەڵکــو ســەرگەردانیو بێناوی لە دوایە، تەنها ئەو پادشــایانە لە ژیانیان دەگەن بە خۆشبەختیو کامەرانی، کە لەگەڵ ژێر دەســتەکانیان نەرمونیاننو دڵســۆزیی ئەوانیان بە دەســت هێناوە، ئەو خاوەن دەســەڵاتانە، هیچ کەس ئارەزووی مەرگیان ناکاتو نەبوون بە مایەی بارگرانیو زەحمەتو ئازار بۆ کەس، لە ڕەحمەتی یەزدان بێبەهرە نابن.

دەبێت مرۆڤی باڵادەست، بترسێت لە ناڕازیبوونو گلەیکردنی ژێردەستەکانی؛ چونکە دوعاو ئاهو ناڵەی مرۆڤی ستەمدیدە لای خودا، بێ وەڵام نامێنێتەوە.

کاتێك دەتوانرێــت وڵاتێك بەنەرمیو بێ توندوتیژی بەڕێوە ببرێت، ئیتر نەفامی نییە، گەر خوێن بڕێژرێتو ســتەم بکرێت لــە خەڵكو باجی زۆریان لێ وەربگیرێت لە پێناو ژیانی دونیایی پادشای نەفامدا.

سوێند بە خودا هەموو دنیا شایەنی ئەوەی نییە، کە خوێنی تاکە مرۆڤێك بڕێژرێت بۆی.



ئا: ئازاد محەممەد بەرگرکەیی

## گە شتێک بەناوەملەکەتە پڕلەعیشقو عیرفانیەکەی

# مەولانای ڕۆمی

* تـــا «زانا»بووم، وا تێگەیشـــتبووم، کە دەبـــێ دونیابگۆڕم، بەڵام کە بووم بە «دانا»، تێگەیشتم، کە دەبێ خۆم بگۆڕم.

* ڕاستی وەك ئاوێنەیەك وایە شکا بێت، کە هەرپارچەیەکی لەلای یەکێك بێت، ئەوکەسەش خۆی تێدا دەبینێتەوە.

* ئاگات لەدڵت بێت؛ با بەلاوی بمێنێتەوە، با لەســـەر ڕووت نوور بدرەوشێتەوە.

* گـــەر بەئاگری عیشـــقی حەقیقی، خۆمان ســـووتاند، ئەو جەســـتەیەمان بەتەواوەتی ڕەش بوویـــەوە، وەکو خەڵوز، ئەوکات ڕۆحەکانمان، دەبێتە پشکۆیەکی بڵێسەدارو گڕێکی بێدووکەڵ.

* عیشق ئاوی حەیاتە، بچۆرە نێوی؛ هەر دڵۆپێکی ئەم ئاوە، دەریای ژیانێکی سەربەخۆیە.

* بۆماوەیـــەك چاولێکەریم بۆخـــۆم هەڵبژارد، گوێم لە ناوم دەبوو، خۆم نەدەدیت، ســـەرقاڵ بووم بەخۆم، کە من شایســـتەی خۆم نەبووم، کاتێ لەخۆم دەرچووم، خۆم دۆزییەوە.

* عیشـــق ڕێگەو ڕێبازی پەیامبەرانە، ئێمە ڕۆڵەی عیشقینو عیشقیش دایکمانە.

* وتـــم: هێندێـــك لـــەو مەســـتبوونەتم پێ نادەیـــت؟ وتی: «نا»نەیزانی، کە هەرئەم نایەی مەستبوونە.

* ئەو کەســـەی لە(کرۆك)بێئاگایـــتو بە(توێکڵ)فریودرایت، بەئاگابە لەنێوەڕاســـتی ڕۆحت، دڵ هەیە، هۆش کرۆکی لاشـــەیە، کرۆکی هۆشت ڕۆحە!

* دڵـــت لە هەموو وێنەیەك خاڵی بکە؛ تا وێنەیەکی وات بۆ دێت، کە وێنەی نەبێت.

* جگە لە خەم، کەسی تر منی لەیاد نییە.

* ئـــەم تەنیاییە، لـــە هەزار ڕۆح چاکترە، ئـــەم ئازادییە لە مولکی دونیا چاکترە، یەك ســـات خەڵوەت لەگەڵ حەق لە ڕۆحو دونیا، لەمەو لەوەش چاکترە.

* ئەوساتەی (عەقڵ)ململانێی(دڵ)دەکات، ڕۆحم (بەپێخواسی) لەم جەنگە ڕادەکات.. شـــێتە ئەوەی لە عاقـــڵان هەژمارم بکاتو عاقڵە ئەوەی لێم ڕابکات.

* لەخۆشەویستی بگەڕێ، چیت لێ دەکات، با لێت بکات.. لێی گەڕێ بابتسووتێنیت، لێی گەڕێ بابوونت بکاتە خاكوخۆڵو گڵ، لە ناخی ئەم گڵەدا، گوڵ شین دەبێت.

* مـــن هەرگیـــز یـــادی ناکەمـــەوە؛ چونکـــە ئـــەوەی یادی دەکرێتەوە.. غائیبە، نەوەك حازر.

* هاوەڵانم نە بەدڵ، نە بەعەقڵ خۆشناوێن. دەگونجێت دڵ بوەســـتێتو عەقڵ بیری بچێتەوە، بەڵکو بە ڕۆح خۆشم دەوێن؛ چونکە ڕۆح نە دەوەستێتو نە بیریشی دەچێتەوە.

* وەهابە کە دەردەکەویت، دەربکەوە کە وەهایت.

* ســـەردەمێك دێت، هیچ شتێك تێیدا مانای نامێنێت، جگە لەخۆدانە دەستی ئەم عیشقە.

* عیشق زەریاکان وەك قۆری(کتری)دەکوڵێنێتو کێوەکانیش دەکاتە لم.

* لە دەرویشـــێکیان پرســـی: دڵت چی دەوێـــت؟ گوتی: ئەوە دڵمە کە هیچی نەوێت.

* هاودڵی لە هاوزمانی باشترو بەرزترە.

* زاهیدان لە ترســـەوە بەپێ ڕادەکەن بـــۆلای خوا، هەرچی عاریفانن، بەباڵ دەفڕن خێراتر لەتیشكو با.

* بیسەربە بەگوێی لێبوردەیی، بینەربە بەچاوی میهرەبانی، بێژەربە بەزمانی عیشق.

* ئامانـــج لـــە نوێژکردن ئەوەیە، خەمـــی دابڕانمت بۆ باس بکەم، دەردەدڵی خۆمت بۆبکەم، گەرنا ئەوە چ نوێژێکە، کە ڕووم لە تۆ بێتو دڵم لە بازاڕ بێت.

* شەریعەت زانســـتە، تەریقەت کردارە، حەقیقەت گەیشتنە بە مەعشوق.

* ئەو عیشقەی لەســـەر بنەمای ڕوخسارو ڕەنگە، لەڕاستیدا ئەوە عیشق نییە، تەنیا ناتەواوییەو نەنگە.

* هەموویـــان لـــە وەرزی بەهاردا خەریکـــی بەرهەمهێنانن، دواجار بەناچاری لە پاییزدا هەڵی دەوەرێنن، ئەوە تەنیا عیشقی تۆیە، کە هیچ وەرزێکی بۆ نییە.



# ڕێگەی بەردەمت ڕووناک بکەرەوە!

بێگەرد فارس

پیاوێکی دەوڵەمەند کۆیلەیەکی هەبوو، بۆ هەموو کارێکی تایبەتی خۆی، بەکاری دەهێنا، هەموو ڕۆژێك ئەگەر بانگی بەیانی بدایە، خەبەری دەکردەوەو چرا فانۆسەکەی هەڵدەکردو پێش گەورەی دەکەوت؛ تا ڕێگەی بۆ ڕووناك بکاتەوە، بۆئەوەی بەسەلامەتی بگاتە مزگەوت، کاتێك کابرای دەوڵەمەند دڵسۆزیو ڕاستگۆیی بەندەکەی بینی. پێیوت: گوێ بگرە، من لە وەسیەتنامەکەمدا ئاماژەم بە ئازادکردنی تۆ کردووە لە پاش مردنم، وەك پاداشتێك بۆ ئەو دڵسۆزییەت، کە دەیان ساڵە تۆ خزمەتی من دەکەیت، خزمەتکارەکەش بێ دەنگ بوو، هیچ شتێکیشی نەوت، پاش ئەوەی گوێی لە ئازادبوونی بوو، پاش مردنی گەورەکەی!

بۆ ڕۆژی داهاتوو هەروەك جاران، خزمەتکاری دڵسۆز فانۆسەکەی هەڵکردو بانگی گەورەکەی کرد؛ بۆ ئەوەی فریای نوێژەکەی بکەوێت، بەڵام ئەوەی سەیربوو ئەوەبوو، ئەم جارە لەبری ئەوەی ڕێگەی پێشی ڕووناك بکاتەوە، دوای گەورەکەی کەوتبوو، ئەویش بەردەمی خۆی نەدەبینی، بۆیە لێی پرسی: بۆچی فانۆسەکە ناهێنیتە پێشەوە؛ بۆئەوەی ڕێگەکەم بۆ ڕووناك بکەیتەوە؟!

وەڵامی دایەوەو وتی: گەورەم تۆ خۆت وات کردووە، نوورەکە لە دواتەوە بێت! کاتێك بەڵێنت دا، پاش مردنت ئازادم بکەیت، لە کاتێکدا ناتەوێ لە ژیانتدا ئەوە بکەیت، بۆچی وام لێدەکەیت بەرامبەر ئازادیم، تەمەنای مردنت بکەم؟ ئایا نازانی من هەتا مردن، خزمەتی تۆ دەکەم، تەنانەت ئەگەر ئازادیشت کردبێتم؟

کابرای دەوڵەمەند لە مەبەستی خزمەتکارەکەی تێگەیشتو پێی وت: لەم ساتەوە تۆ ئازادیت.

ئەویش لەوەڵامدا وتی: منیش لەم ساتەوە، خزمەتکارێکی زۆر باشت دەبم.

ئەمە وانەیەکە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ کاری باشیان بۆ پاش مردنیان بێت، نەك ئەو ساتەی لە ژیاندان؛ بۆئەوەی بەردەمیان ڕووناك بێت، نەك پشتەوەیان.

بەو کەسانە دەڵێم، کە بە نیازن پاش مردنیان، قوتابخانە، یان مزگەوت، یاخود هەرکارێکی خێرخوازییان بۆ ئەنجام بدرێت، دەستپێشخەری بکەن هەتا لە ژیاندان، ئایا پێتان وایە پاش مردنتان بۆتان جێبەجێ بکەن؟ بۆچی ئەو کارە باشە، خۆت نەبیت ئەنجامی بدەیتو ڕێگەی خۆت ڕووناك بکەیتەوە؟ هەربۆیە خۆت چراکەت هەڵبگرەو پێش خۆت ڕووناك بکەرەوەو لە دوای خۆت بەجێی مەهێڵە!

ئەسکەندەر ڕەحیم



# هونەری هەڵکردن لەگەڵ گرفتەکاندا

یاریزانێک دەگێڕێتەوە: ئەمن کاتی خۆی لە نمرە دووی تیپێکی تۆپی پێدا یاریم دەکرد. ڕۆژێکیان ڕاهێنەرێکی نوێمان بۆ هات، کە لە ساڵانی ڕابوردوو، لە ڕیزەکانی هەڵبژاردەی نیشتمانیدا یاری کردبوو.. لە یەکێك لە پاڵەوانێتییە گرنگەکاندا، ئەو ڕاهێنەرە داوای لە یەك بە یەکی ئەندامەکانی تیپەکە کرد، کە تەوقە لەگەڵ یەکدیدا بکەنو یەکدی لە ئامێز بگرنو ئەم لا و لای یەکدی ماچ بکەنو بە ناوی خۆی بانگی بکەن. ئیدی هەموو یاریزانێك هەستاو ئەوەی ڕاهێنەرەکە ویستی، ئەنجامی دا.. پاش ئەوەی چووینە ناو یاریگاوە، بەگیانو دڵ باشترین یاریمان کرد، کە لە مێژووی ئەو تیپەدا وێنەی نەبوو، هەروەها توانیمان یارییەکە لە بەهێزترین تیپی گرووپەکە ببەینەوە.

پاش کۆتاییهاتنی پاڵەوانێتییەکە، ڕاهێنەرەکە هات بۆ لامانو پیرۆزبایی دەستخۆشی سەرکەوتنی لە هەموانو یەکە بە یەکەی یاریزانەکان کرد، پێش ئەوەشی زەمینی یاریگاکە بەجێ بهێڵین، پرسیارێکی ئاڕاستە کردین: کێتان دەزانێت، بۆچی داوام لە هەمووتان کرد، تەوقە لەگەڵ یەکدیدا بکەن، یەکدی لە ئامێز بگرن، یەکدی ماچ بکەنو یەکدی بە ناوی خۆتانەوە بانگ بکەن.

گوتمان: بۆئەوەی پەیوەندیی خۆشەویستیو برایەتی، لە نێوانماندا پتەو بێت.

گوتی: ئەمە بەشێکی سادەی کارەکە بوو، بەڵام گرنگترین شت ئەوەیە، کە من لە بواری وەرزشدا، ئەزموونێکی دوورودرێژم بڕیوەو لەو ئەزموونەوە ئەوە فێربووم، کە لە هیچ تیپێکی سەرکەوتووی جیهاندا، چ لە ئاستی تیپە میللییەکاندا بێت، یاخود یانەکان، بگرە لەهەڵبژادە جیهانییەکانیشدا بێت، گیروگرفت لە نێوان یاریزانەکانیدا نابینیت.. ئەوەی ویستم لەم کارە، ئەوەیە: گشت گیروگرفتەکانتان بخەنە ناو توورەکەیەکو دەرەوەی گۆڕەپانەکەدا دای بنێن؛ بۆئەوەی هەمووتان کۆمەڵە یاریزانێك بن لە یەك جەستەدا، هەروەها کاتێك لە گۆڕەپان دێنە دەرەوە. سەرجەم گیروگرفتەکانی ناو گۆڕەپان، هەر لەناو گۆڕەپان بەجێ بهێڵنو لەگەڵ خۆتاندا هەڵی مەگرن، هێڵی جیاکەرەوەش، هەر هێڵی چواردەوری یاریگایە. ئەمەش لە ژیانی ڕۆژانەشدا، بەکەڵکتان دێت.

خوێنەری بەڕێز: کاتێك لە کار دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ، هەموو کێشەکانی کارەکەت، لە توورەکەیەکداو لە دەرەوەی ماڵەکەت دابنێو بەبێ گرفت بچۆرە ناو ماڵەوە. کاتێکیش دەچیتە سەر کار، گشت کێشە خێزانییەکانت، لە پشت دەرکەی ماڵەکەت دابنێو مەیبەرە سەر کار؛ بۆئەوەی کێشەو ناخۆشییەکان، لەسەر خۆت، نەکەیت بە چەند قاتو بار.

# چۆن وادەکەیت فێربوونی زانست سەرنجی منداڵەکەت ڕابکێشێت؟

لە چێشتخانەوە بۆ پارک، تەنانەت لەدانیشتنی ناو پاسیشدا، زانست هەموو چواردەوری ئێمەی تەنیوە. هەوڵ بدە هەندێك لەو چالاکییە زانستییانە بە مێشکە بچووکەکەی منداڵەکەت ئەنجام بدەیتو نوقمی بکەیت لەناو حەزێکی زۆردا بۆ زانست. ڕێگەی پێ بدە بەشوێناندا بگەڕێتو ورد ببێتەوەو زانیاری کۆ بکاتەوەو پێکەوە چێژو خۆشی لێوەربگرنو سەرنجڕاکێشی بکە لەلای.

## هەنگاوەکان

**ڕەچەتەی داهێنانەکە:** ئاساییە چێشتخانە ئەو شوێنەیە کە یەکەمجار منداڵ لێیەوە، فێری کارلێکە کیمیاییو فیزیاییەکان دەبێت لە مادەکاندا. هانی منداڵەکەت بدە چێشت لێ بنێت، خۆی پێکهاتەکانی چێشتەکە دروست بکاتو هەمووی بنووسێت، وەکو کتێبێکی چێشتلێنان. ڕێی بدەن خۆی بڕیار بدات، چ شتێکی تێ بکاتو بە چ بڕێك بۆی زیاد بکات. پاش هەموو شتێك، یەکەمجار خۆت تامی خواردنەکە بکە، پاشان پێکەوە گفتوگۆ لەسەر چۆنێتیی پێکهاتنی خواردنەکەو چۆنێتیی گۆڕانی مادەکان بکەن، ئینجا هەوڵ بدەن بەشێوەیەکی زانستیانەتر، دووبارەی بکەنەوە.

**ڕێی پێ بدە، یاری بە خۆڵ بکات:** بە خۆڵڕێژی پلاستیك، یان ماڵە، تەنانەت ئەگەر بە کەوچکیش، یان هەر شتێك کە زەوی پێ هەڵبکەندرێت. هەرچەندە لەلایەکی تریشەوە، لەوانەیە دەستی یان جلەکانی چڵکن بکات، بەڵام هەڵکەندنی زەویو یاریکردن بەخۆڵ، زانیاری بە منداڵەکەت دەدات لەبارەی جۆرەکانی خۆڵو بەرد لە شوێنێکی دیاریکراودا. هەروەها یارمەتیی منداڵەکەت دەدات؛ ئەو گیاندرانە ببینێت، کە لە ژێر زەویدا دەژین، ئەو بەخۆڵ یاریکردنە، وا لە منداڵەکەت دەکات، لە ناخی خۆیدا دەست بە لێکۆڵینەوە بکات.

**لە کاغەز، فڕۆکەی بۆ دروست بکە:** ئەم تاقیکردنەوەیە جێگایەکی کەم لە ژوورێك، یان لەدەرەوە داگیر دەکات بۆ ئەنجامدانی، هەروەها دەتوانیت لەدەرەوە فڕۆکە لەگەڵیدا هەڵبفڕێنیت؛ تا بیرۆکەیەك لەسەر چۆنێتیی هەڵفڕینی شتە جیاوازەکان لەهەوادا وەربگرێت. هەروەها لە ئینتەرنێت بگەڕێ؛ تا بزانێت، ئایا هەر شتێك چۆن دەفڕێت.

**تێبینیی جەستەی مرۆڤ بکەن:** تێبینیکردنو پرسیارکردن لەبارەی جەستەی مرۆڤەوە، هەلی گەڕانو لێوردبوونەوە بە منداڵەکەت دەدات، بیرۆکەی زانستی دەداتێ لەبارەی چۆنێتیی ژیانی مرۆڤەوە، جیاوازیی ئەندامەکانی جەستە، کە چۆن شوێنێکی دیاریکراو، فەرمانێکی دیاریکراویشی هەیە. بە منداڵەکەت بڵێ بەوردی سەیری بیلبیلەی چاوت بکات، کاتێك ڕووناکییەکی زۆر، یان ڕووناکیەکی کەمی لێ نزیك بکەیتەوە. لێرەوە دەتوانێت بەباشی هەست بکات، بیلبیلە لە کاتی بینینی ڕووناکی زۆردا، بچووك دەبێتەوە، لەگەڵ ڕووناکی کەمیشدا، گەورە دەبێت. بەم جۆرە منداڵەکەت هان دەدەیت، بیر لە فەرمانی بەشەکانی تری جەستە بکاتەوە.

**لەبارەی پلەی گەرمیشەوە فێری بکە:** دەتوانیت لە ماوەی ئەنجامدانی ئەمەدا، ناوچەیەکی ئاسایی یاریکردن، بکەیت بەشوێنێك بۆ فێربوونی زانست. بە پشتبەستن بە پلەی گەرمی، هەست بە گەرمیو ساردیی شوێنە جیاوازەکانی سەر زەوی دەکرێت. منداڵ هەست بە مەترسیی شتێکی گەرم دەکاتو خۆی لێ دوور دەخاتەوە. بۆ نموونە: پارچەکانزایەکی گەرم. لەگەڵ منداڵەکەتدا پێکەوە دەست لەچەند پارچە توخمێك بدەنو تێبینیی چەندێتیی گەرمیی گەیاندنیانو جیاوازی لە پلەی گەیاندنیاندا بکەن.

**لە ئاسمان ورد ببنەوە:** سەیری جیاوازیی هەورەکانو پێکهاتنیان بکەن، تێبینیان بکەن، کە بەپێی جۆرو ڕەنگی هەور، کەشو هەوا دەگۆڕێت. بۆ نموونە: خۆر لەئاسمانێکی بێهەوری شیندا، بریسکە دەداتەوە، بەڵام ئەگەر ئاسمان هەورێکی خۆڵەمێشی دای پۆشیبوو، خۆریش خۆی لەپشتیانەوە حەشار دەدات. ئێستا لە منداڵەکەت بپرسە: ئایا بە بۆچوونی ئەو، دواتر کەشو هەوا چی لێ دێت؟

**سەیری شێوەکان بکە:** بەوریاییەوە بڕوانن، بزانن چەندان جۆر مێروو لەژێر زەویدا دەژین، هەروەها چەندان باڵندەو ڕووەك، تەنانەت لە هەموو بەشێکی بچووکی زەویشدا دەژین. دەتوانیت هێلاهوپ بەکار بهێنین، لە زەویدا دای بنێ بۆ دروستکردنی بازنەیەك، بەمنداڵەکەت بڵێ: سەیری زەوییەکە بکات؛ تا بزانێت چ زیندەوەرێك دەدۆزێتەوەو لەو پارچە زەویە دیاریکراوەدا دەژی. هانی بدە لە ڕووەکەکان ورد ببێتەوە، هەروەها خەیاڵ بکات ئایا ژیان چۆن چۆنی دەبوو، ئەگەر ئەو لەجێی مێروولەیەك بوایە. ئەم چالاکییە منداڵ فێر دەکات؛ نرخی ژیانی زیندەوەرەکان بزانێت، تەنانەت لە زەویەکی بچووکیشدابێت.

سەرچاوە: www.wikihow.com

هێشوو والی





# بێ تۆ

گەرمیانی

دەبێ بێ ئافتابی ڕوومەتو سوبحی جەبینی من
چ فەرقێکی ببێ، ڕۆژی لە شەو، سوبحی لە ئێوارە -مەحوی-

ئای لەو دڵەی بە شوێن خۆیدا دەگەڕێ!
ئای لەو سینەیەی تاسەی هەناسەی خۆی دەکا!
ئای لەو گوێچکەیەی بۆ چرپەیەك گڕی گرتووە!
ئای لەو لاشەیەی بەدووی ڕۆحی خۆیدا وێڵە!!
ئای لەو سۆمایەی بەشوێن ترووسکەی بینایی خۆیدا سەرگەردانە!!
ئای لەو چۆلەکەیەی، کە لە شەوێکی ساردی زستاندا، هێلانەکەی لێ ونبووە!!
ئای لە بێتۆیی!
ئای لە مەحروومبوون لە دەنگ و سەدای تۆ!
چ دەنگێکی بەهەشتیت، کاتێك بانگم دەکەی!
چ ئاوازێکی ناسکی!
چ نوورێکی بۆ دیدەم، چ ڕۆحێکی بۆلاشەم!

ڕۆشنکە چاوی مونتەزیرانت، بە گەردی ڕێت.
تۆ دێیو نووری دیدەی من دێ بەپێتەوە -مەحوی-

چ نازێکم دەکێشێ نازدارەکەم!!
من بێ تۆ، گوڵێکی زەرد، کانییەکی بێئاو، ڕەزێکی وشکو پەرێزێکی سووتاوو چرایەکی خامۆشم!
بێ تۆ، لێوێکی خەندەلێدزراوو بەهارێکی بێنێرگزم!
بێ تۆ، باڵندەیەکی باڵشکاوم!
چی دەبێ کە هاتی، ئیدی نەڕۆی،
کە ئاوێزانت بووم، ئیدی جێم نەهێڵی!

وتم: ئەی دڵ، لە دولبەر شەکوەکردن حەیفە، دڵ دەیوت:
ئەمە، بۆ دولبەرێکی دڵنەوازە، ئەو دڵئازارە.

وتم: خۆشە بە ئومێدی وەفا، جەوروجەفا دەیوت:
بەسەر چوو عومرمو نەمدی، وەفایەك لەو جەفاکارە-مەحوی-

بەڵام تۆ، مافی خۆتە شەکوا بکەی، ئاخر ئەگەر سکاڵای دڵت لای من نەکەی، لای کێی دەکەی؟!
تۆ هەموو شەوێ، بە تاسەی ئەو بەیانییەوە دەخەوی، کە بە پێکەنینی من، بەخەبەر دێی!!
بە بەرچاوەکانی تۆوە، دێمە سەر خوانی ڕۆحو بە دەستەکانی تۆ، ئاوی حەیات بنۆشم!
حەقی خۆتە، ئازیزم حەقی خۆتە...
تۆ سکاڵا لە دووری دڵو ڕۆحی خۆت دەکەی، تۆ ناڵەی دیدارو گڕی تاسە دەتسووتێنێ! تۆ لە چاوەڕوانیدا، خەریکە چاوەکانت وەکوو مۆم دەتوێنەوە!

بە تاری زوڵفو گوڵناری جەماڵی تۆ، بە ڕۆژو شەو
سەرم دەربەندی سەودایە، دڵم سەرگەرمی سووتانە-وەفایی-

خۆ ئەگەر لێم بپرسی. چۆن دەژیت؟
نازانم چیت وەڵام دەم! تەنها ئەوەندە دەڵێم:
دەبێت ژیان بێ ڕۆحو بێ دڵو بێ دیدەو......
بێبۆنی مەحبووب، چۆن بێت!
دەبێت ئەو ژیانە، بە چی ژیانێك نێوزەد بکرێت؟!
کەسێکیش لۆمەم دەکا، کە هیچ لە ئەوین نەزانێو بێئاگا بێ لە حاڵی ئەوینداران!

لەتاو ئاوری جەماڵت، کەی دەزانێ حاڵی دڵسۆزان
کەسێکی تاوەکو زوڵفت نەشێوابێ، نەسووتابێ؟!

-وەفایی-



# نامە نوورییەکان

## نامەی چل وهەشت

ماموستای ئازیزم، کاتێك بۆ دەوروبەری خۆم دەڕوانم، بە هەر چوارلامدا، دەیان مرۆڤی سەرگەردانو داماو دەبینم، کە نوقمی دەریای غەفڵەتنو بێئاگا لە ژینو دین، ڕۆژەکانی تەمەن بەڕێ دەکەن!

دەیانبینم، تۆزی خەمێکی زەرد، ڕوخساری داپۆشیون، لە سیمایاندا دەیان پرسیارو سەدان ئەندێشەو خەیاڵ دەخوێنرێتەوە، سەریان لێ شێواوە، نازانن چی دەکەن!

ناشزانن دەبێ چی بکەن؟!

بەشوێن سەرابدا ڕادەکەنو بە شەرابی دەزانن!

شوێن دێوەزمە کەوتوونو بە شاجوانی دەزانن!

لە دەڤەری نوور ڕادەکەنو خۆ دەهاونە نێو کەندەڵانی ئاگر!

لە باوەشی فیردەوس هەڵدێنو دەچنە نێو باوەشی ئەژدیها!

ئای ماموستا، ئەمانە چەندە داماوو هەژارن!

ئازیزم، زۆرن ئەوانەی وێڵی سەعادەتو بەختەوەرینو ڕێگاکەی نادۆزنەوە!

زۆرن ئەوانەی مەحرووومن لە نووری ئیلاهیو لە شەوەزەنگی نەفامیدا، پەلەقاژەیانە!

زۆرن ئەوانەی لە شیلەی شەهدی ئیمان بێبەشن..

زۆرن ئەوانەی کە خۆیان لێ ونەو لە مرۆڤبوونی خۆشیان مەحرووومن!

زۆرن ئەوانەی کە بوونەتە نێچیری ئەهریمەنو دەسکەلای شەیتانۆچکەکان!

زۆرن ئەوانەی هێشتا تیشکی باوەڕ نەیتوانیوە، لە کلاورۆژنەی دڵیانەوە بچێتە ژووری!

زۆرن ئەوانەی کە هێشتا دەستێکی نەرم، نەیتوانیوە فرمێسکەکانیان بۆ بسڕێو باوەشێکی گەرم نەیتوانیوە لە ئامێزیان بگرێ!

ئای ئەگەر دەستیان دەگاتە "عروة الوثقى"و دەچنە نێو گوڵزاری ئیمانو ئاشنا دەبن بە ئاوازی ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ﴾ الزمر: ٥٣

ئای بۆ موصعەبێ، ڕۆحیان میسکڕێژو سۆمایان بە کلی نبوەت، سورمەڕێژ بکات!

ئای بۆ هەلگرانی ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ فصلت: ٣٣

ئای بۆ موعازێك بەنەرمیو دانایی یەمانی خۆیەوە!

گەر ئێمە نەچین بە پیریانەوە، کێ بچێ؟!

گەر ئێمە نەیانگەینێ، بۆ کوێ دەچن؟!

گەر ئێمە نەبین، ئیدی کێ خەمی ئەمانو هەزارانی وەك ئەمان بخوات؟!

کێ دەستیان بگرێت، بەرەو کەناری دڵنیایی!

کێ تەپوتۆزی خەمو پەژارەو نەهامەتییان بڕەوێنێتەوە؟!

ئازیزم، ئێمە تاکەی دەبێ هەر تەماشا کەین!

ئەوان وا دەخنکێن بۆ دڵۆپێ میهری خودایی.

ئەوان وا دەسووتێن بۆ چرپەیەك لە هەنگوینی حەقیقەت!

ئەوان بۆ ترووسکەیەك وێڵن؛ تا بەرپێی خۆیان بدۆزنەوە!

ئای ئێمە چەند گوناهبارین!

ئۆباڵی ئەوان، وا بە ئەستۆی ئێمە!

کەی بچینو دەستێك بدەینە دەستی شکستیان..

کەی بچینو برستێك بدەینە جەستەی شەکەتیان.

ئێمە نمەی بارانین، پرووشەی ئاونگین، نەرمیی شەونمین، شنەی سروەی شادین.

ئێمە نەبین، کێ پەیامی دوایین پەیامبەر بگەیەنێ، کێ موژدەی فیردەوسو نیدای..

﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ الزخرف: ٦٨

ڕاگەیەنێ؟!

دەی ئازیزان دەی، کات زۆر درەنگە، ناتانەوێ لە بەهەشتا، لەگەڵ موصعەبو موعازدا کۆ ببنەوە؟!

ناتانەوێ پێشەوای سەروەرمان، شانازیتان پێوە بکات؟!

خێرا کەن، بەدەستی بەدەستنوێژو سیمای نوورینتانەوە فریا کەون.. دڕ بەم شەوەزەنگی نەفامییە بدەن!

# لەگەڵ شێخ سەلامی شاعیردا



شاعیر ناوی سەلام کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدولکەریمەو لە ساداتی عازەبانە. ساڵی ١٨٩٢ لە دێی عازەبان لەدایک بووە. بۆ خوێندن چووەتە گوندی ئەحمەد برندەو پاشان سلێمانی.

شاعیر لە زۆرێك کاروباری ئیداریی ئەو سەردەمەدا، کاری کردووەو زۆربەی ژیانی بۆ خزمەتی خاکو وڵاتو گەلەکەی تەرخان کردووە.

خاوەنی دیوانێك شیعری جوانو شاکاری وەرگێڕانی چوارینەکانی خیامە بە کوردیو ساڵی ١٩٥٩ کۆچی دوایی کردووە.

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

### چاوی صەییادە

چاوی صەییادە، دەخیلە زوڵفی داوە دانەخاڵ
چۆن نەجاتی قەتع نابێ، عاشقی وێرانەماڵ
گەر ببینن لێوی ئاڵو چاوی کاڵی مەستی تۆ
مەستو بێپەروا بیللا، پیری کامڵ ئەهلی حاڵ
من لە عەشقی ڕوویی گوڵڕەنگیو دڵی وەك سەنگی تۆ
وشك ئەبێ لێوو زمانم، زەردو سیسە ڕەنگی ئاڵ
گەنجی کونجی خەڵوەتم، بێ گەنجی قاڕوون بۆچییە؟
وەسڵی تۆم گەر دەس کەوێ، قەت نامەوێ تاڵانو ماڵ
خەنجەری برژانگی تیژت، جەرگی لەتلەت کردم وەلێ
جەوهەرێکی خستە توێی دڵ، نایەوێ قەت مشتوماڵ
من لە ئەو خاکەم، کە تەئریخی هەموو عالەم ئەڵێ:
ڕۆستەمی لێ بوو، چی ڕۆستەم؟ ڕۆستەمی ئەولادی زاڵ!

* * * * *

### کورد

کورد هەمووی دڵسۆزە، ئەمما پیاوی هۆشیاری کەمە
ئەو کەسەی پیاوە، خەریکی میحنەتو دەردو خەمە
من بە مەنتیق هەر قیاسی وەزعی کوردستان ئەکەم
حاسڵی ئاخر نەتیجە، چاووراوەو هەمهەمە
دەستەپاچە، بێزمانن ڕووبەڕووی بێگانەکان
خۆبەخۆی خۆیان، دەمانچەو خەنجەرو شیرو قەمە
بوو بە دۆزەخ نیشتمانت، پڕ لە دیلو بەندییە
خۆ بەهەشت بوو، سەیری کە ئەم شاخو دەشتو گوێچەمە
بێشەیی شێرانی "ماد"و جەرگەی کوردانی گورد
مامەڕێوی خۆیو کلکی تیا ئەکا گاڵتەو گەمە
کوردە هەڵسە، ڕاپەڕە، تاکەی وەها تۆ دیل ئەبی
قەومی سەربەرزت بەجارێ، ژێرچەپۆکەی عالەمە
ئاسمانی عەدلو عیرفانی، زەمانی عەسری نوور
هەر لە عاستی قەومی کورد، تاریکونووتەك، هەر تەمە
بۆ برینی زامو ناسۆری سیاسەت بێ حەکیم
ئیتیفاقو یەکیەتی، وەك پانسلینو مەڵحەمە
هیچ گەلێ بێ پێشەوا، پێشکەوتنی هۆزی نەدی
چۆن بەبێ شوان ڕائەگیرێ، مێگەلو ڕانو ڕەمە
وا (گوریسێکی سیاسەت) بادراوە گورزە هۆن
ڕای ئەکێشن، جووڵە ناکا، کورد لەجێی خۆی مەحکەمە
(گورزە هۆنە) ئەم گوریسە بەڵکی (شیرازەی) هەیە
هێزی کوردە، لابەری ئەم شیرازەو هەم شەرزەمە
بێ محامی، بێ تەشەبوس، حەقی خۆی داوا ئەکا
ڕووتوقووتیو ناتەواوی، شاهیدن بۆ مەحکەمە
خاکو ئاوی بەشکراوە، سوخرەکێشە پیاوو ژن
(مەحکەمەی عەدلی دوەل) تەمسیل ئەکا، (مامە خەمە)
تۆبڵێی ڕۆژێ بەلای کوردا فەلەك چەرخێ نەدا
دەربخا نەجمی سەعادەت، ڕاپەڕی کورد ئەو دەمە
هیچ گومانی تیا نییە، تەئریخ نۆرەو دەورەیە
ڕۆژی شین، ئەڵبەت ئەبێتە ڕۆژی شاییو زەمزەمە